## ژمارەکانی ڕابردووی ڕۆڤار

ئیبراهیم ئەحمەد، محەمەد مەولود (مـەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامید، سوارە ئیلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هـەردی، یەڵماز گۆنای، ئیسماعیل بێشکچی، موحەرەم موحەمەد ئەمین، دڵدار، مەستورەی ئەردەڵانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، جەلالی میرزا کەریم، ڕەفیق چالاك، عەبدولخالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریانی، ئەمین فەیزی، کامەران موکری، جەلال تەقی، حەمە سالح دیلان، هەژار، شاکر فەتاح، کاکەی فەلاح، عەلائەدین سەجادی، شێخ محەمەدی خاڵ، حسێن عارف، عەلی ئەشرەفی دەروێشیان، سەلیم بەرەکات، پێشەوا قازی محەمەد، مەحمود مەلا عیزەت، فایەق بێکەس، عەبدوڵا پەشێو، جگەرخوێن، بابەتاهیری عوریان، عەرەب شەمۆ، دڵشاد مەریوانی، مەنسوری یاقوتی، حەسەنی قزڵجی، برایم ئەمین باڵدار، مەسعود محەمەد، بەختیار زێوەر، نەجمەدینی مەلا، مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی، لەتیف هەڵمەت، حاجی قادری کۆیی، پیرەمێردی نەمر، مەلا مەحمودی بایەزیدی، شێخ ڕەزای تاڵەبانی، شەریف پاشای خەندان، جەمیل صائیب، ئەحمەد موختار جاف، عەبدولڕەحیم ڕەحیمی هەکاری، میر شەرەف خانی بەدلیسی، وەفایی، گۆران، بەدیع باباجان، جەمال شارباژێڕی، مارف بەرزنجی، نالی، مەحموی، ئەنوەر قـەرەداخـی، حەمەی مەلا کەریم، سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی، ئیبراهیم یونسی، قەرەنی جەمیل، مەلای گەورەی کۆیە، تۆفیق وەهبی بەگ، محەمەد ئەمین زەکی، عەبدوڵڵا جەوهەر، مستەفا بەگی کوردی، شێرکۆ بێکەس، سالم، عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ، ئەحمەد کایا، مەولەوی،قانیع.عوسمان چێوار.


**سەرنووسەر**
**ڕەووف بێگەرد**

**بەڕێوەبەری نووسین**
**ئیدریس عەلی**

**گرافیك دیزاین**
**ئارام عەلی**

تیراژ: ١٢٠٠

نرخ: ١٢٥٠

**ناونیشان**
**سلێمانی- شارێی سالم**
**دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم**

www.sardem.org

**پەیوەندیکردن بەڕۆڤارەوە لەڕێگەی**
**ئیمێڵی**
edrisali16@yahoo.com

**چاپخانەی**
**دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم**

پێرست

# سەروتار

ڕۆڤاری ئەمجارەمان لەسەر مامۆستا (کەریم کابان)ە، تایبەتە بە هونەرمەندیک کە زیاتر لە نیوسەدەیە لەڕێگەی دەنگە خۆشەکەی و ئاوازە جوانەکانیەوە خزمەت بە ڕەوتی هونەری و گۆرانی کوردی دەکات.
نایشارینەوە کاتێک لە ژمارەی پێشودا ڕامانگەیاند کە ژمارەی داهاتووی ڕۆڤار لەسەر مامۆستا (کەریم کابان)ە، چاوەڕوانی ئەو پێشوازییە گەورەیەمان نەدەکرد کە لەلایەن هونەرمەندان و نووسەران و تەنانەت خەڵکە ئاساییەکەشەوە لیمانکراو دەستخۆشییان لێکردین بۆ ئەم هەنگاوە، بێگوومان ئەمەش ئەو ڕاستییەی لەلا دووپات کردینەوە کە هونەرمەندی ناوبراو بە قوڵی ڕۆچووەتە ناو ڕۆح و دڵ و دەروونی کۆمەڵانی خەڵک و هونەردۆستانەوە.
دیارە کەریم کابان هەروەک کەسانی پسپۆڕ و شارەزا لەم ژمارەی ڕۆڤاردا ئاماژەی پێدەکەن، لەسەر کۆمەڵێک ئاست و ڕەهەندی جیاجیا هەنگاوی گەورەی هونەری ناوە و توانیویەتی هەم بەهۆی ئاوازەکانییەوە هەم بەهۆی هەڵبژاردەی تێکستە شیعرییەکانەوە هەم بەهۆی ئەداکردن و دەنگە خۆشەکەیەوە ببێتە خاوەن خەسڵەت و شێوازی تەیبەت بەخۆی کە بەئاسانی بتوانرێت لەلایەن گویگرانەوە دەنگ و هونەرەکەی بناسرێتەوە و بەبەردەوامی چێژی لێ ببینرێت، ئەگەرچی کەریم کابان لەڕووی چەندایەتییەوە خاوەنی چەند گۆرانییەکی کەمە، بەڵام دەبینین و دەبیستین لەڕووی چۆنایەتییەوە کارەکانی دەگمەن و ناوازەن، ئاخر گرنگی هونەری مەزن بەشێکی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە نەوە دوای نەوە گویی لێ بگیرێت و قبوڵ بکرێت و جوانی و بەهای بەرزی هونەری خۆی لەدەست نەدات، بە دڵنیاییەوە وەک لە بابەتەکانی ئەم ژمارەی ڕۆڤاردا دەبینن و دەیخوێننەوە، مامۆستا کەریم کابان لەو هونەرمەندانەیە کە بەشێوازی هونەری خۆی دەناسرێتەوە و توانای بڕینی زەمەن و سەردەمەکانی هەیە، چونکە بە سرووشتی خۆی خاوەنی دەنگ و شێوازیکی هونەریی ڕەسەنە کە ئێجگار نزیکە لە ڕۆح و دەروون و هەستی ئینسانەوە.
ئەفسوس لە ئێستادا کە ئێمە خەریکی ئامادەکردن و دەرکردنی ڕۆڤارین لەسەر کەریم کابان، ناوبراو بەهۆی ناجێگیریی باری تەندروستییەوە لەجێدا کەوتووە و بەجەستە زیندو و زیتەڵەکەی خۆیەوە لەناوماندا نییە و گوێبیستی سڵاو و قسە خۆشەکانی نین، بەڵام دەنگ و هونەرەکەی بەبەردەوامی لێرە لەناو دلماندا دیت و دەچیت و گوێبیستی دەبین.

**سڵاو لەو هونەرمەندە خۆشەویست و بەڕێزە**

**بەڕێوبەری نووسین**

# ژیاننامەی کەریم کابان

عەبدولکەریم جەلال مەحموود عەزیز کابان، ناسراو بە هونەرمەند کەریم کابان، ساڵی 1927 لە شاری سلێمانی لە گەڕەکی شێخان لەدایک بووە. باوکی کابان، چایچی بووە و لە هەمان کاتدا دەنگخۆش و دەفژەنێکی لێهاتووی نێو مەولودخوێنانی شاری سلێمانی بووە. دایکی ناوی (حەلاوە عەلی)یە، لە بنەماڵەیەکی دیاری شاری سلێمانی بووە. سەرەتا لە قوتابخانەی ئایینی، واتە حوجرە خوێندوویەتی، دواتر چووەتە قوتابخانەی فەیسەڵیە و دوای تەواوکردنی قۆناغی سەرەتایی بووە بە پۆلیس.

سەرەتای دەرکەوتنی توانای هونەری کەریم کابان بۆ ئەو کاتە دەگەڕێتەوە، کە وەک دەنگخۆشێک لە تیپی سروودی قوتابخانەکاندا بەشداریی کردووە.

دەرکەوتنی زۆرتری ئەم هونەرمەندە بۆ سەرەتای چلەکانی ئەو کاتانە دەگەڕێتەوە، کە ئینگلیزەکان لە بەردەرکی سەرای شاری سلێمانیدا ئێستگەیەکیان دامەزراند و ئەمیش لەویدا گۆرانیی وتووە و هەر لەو کاتەشدا یەکەم گۆرانیی خۆی بە ناوی (لە ڕێی دڵداری) بۆ ڕادیۆی بەغدا تۆمار کردووە.

کابانی دەنگخۆش و هونەرمەند لە ژیانی هاوسەریدا دوو ژنی هێناوە، لە ژنی یەکەم کچێکی هەیە و لە ژنی دووەم سێ کوڕ و دوو کچی هەیە.

لە بواری ئاوازدانانیشدا کاری کردووە و ئاوازی بۆ زۆربەی گۆرانییەکانی خۆی و قادر کابانی برای و عوسمان عەلی و چەند هونەرمەندیکی دیکەش داناوە،

جگە لە ئاستبەرزی و کاریگەریی هونەرەکەی، کەریم کابان وەک کەسیکی نیشتمانپەروەر و نەتەوەیی دەرکەوتووە و ئەمەش هۆکار بووە بۆ ئەوەی ماوەی چەند ساڵێک بۆ شارەکانی ناوەڕاست و باشووری عێراق دوور بخرێتەوە. ساڵی 1974 پەیوەندیی بە شۆڕشی نوێوە کردووە و لە شاخ و لە ڕێی ڕادیۆی شۆڕشەوە چەند بەرهەمێکی بڵاو کردووەتەوە، دوای نسکۆی شۆڕشیش بۆ جاری دووەم بۆ شارەکانی ناوەڕاستی عێراق دوور خراوەتەوە و بەم هۆیەشەوە ماوەیەکی زۆر لە کاری هونەری دابڕاوە.

بەگشتی، هونەرمەند کەریم کابان لە ماوەی ژیانیی هونەریدا لە چەندین ئاهەنگ و فێستیڤاڵدا بەشداریی کردووە و چەند جارێکیش خەڵات کراوە.

ئەگەرچی کەریم کابان لە ڕووی چەندایەتییەوە خاوەنی چەند بەرهەمێکی کەمی هونەرییە، بەڵام لە ڕووی چۆنایەتییەوە خاوەنی هونەرێکی بەرز و کاریگەرە و گۆرانییەکانی هێز و وزەی ئەوەیان هەیە سەدەکان و زەمەنەکان ببڕن و نەوە دوای نەوە بەهای هونەرییان لە ئاست چاوەڕوانی و چێژی گوێگراندا بێت.

# کەریم کابان

## ڕێحانەیەک لەدەنگی خۆش

**شێرکۆ بێکەس**

ئەو وەختەی وڵاتێک یادەوریی بە پەنجەی پەلکە گیایەک، یان بە دەنووکی بولبولێک، یان بە نووکی تیشکێ یان بە ڕێزەی باران و ڕەنگی زیوینی مانگەشەوێ ئەنووسێتەوە! بەر لە هەمووان بەهرەداران و ناوی ئاوێنەکانی هەست و نەستی ئەهێنێ. ئەو دەنگە خۆشانە لە ڕیزێکدا پێش ئەخات کە لە: تیریژی چاو و پەلکەڕەنگینەی ڕۆح و خوڕە و هاژەی جەستەی خۆیان بە خۆشەویستیی نەمر و تا هاتای

گەلەکەیان بەخشیووە!
دانە بەردی هەموو شاخێ چون یەک جوان نین!
هیچ باخێ نییە درەختەکانی هەموو چون یەک پڕوپۆ بهاون!
هەرچی شەپۆل بوو، مانای ئەوە نییە ئیتر ئەبێ دەنگی خۆشبێ. هەرچی قەڵەم بوو، مانای ئەوە نییە دەم بەگوڵە!
هەرچیش باڵندە بوو، مانای ئەوە نییە بەرزەفڕە!
لە سەردەمێکدا، کە هێشتا ئەم شارە باڵای نەکردبوو، نەبووبوو بە کوڕە شار و ماسولکەی نێو شان و بازووی بەهێز نەبووبوو. گەڕەک و کۆڵانەکانی، دەشتودەری، شاخ و گردۆڵکەکانی دەوروبەر وەختێ گوێیان لە دەیان نەغمەخوان و گۆرانیبێژ ئەگرت، بەڵام لە یادەوریی هەوویاندا (ئەحەی ناسر)ێک هەبوو، کە بای بیرچوونەوە نەیئەبردا!
لە سەردەمانێکدا هەر لێرە مەلا و فەقێی مزگەوتێ نەبوو. ڕۆژانە چەند شیعرێ وەک چاوەزار بۆ بانگەشە بە دەرگا و دیواری ژوورەکانیانەوە هەڵنەواسن.
وەلێ بە تەنها هەر تارەوەن و ژووری خانەقاکەی حەزرەتی (نالی) و شیعرەکانی ئەو مانەوە و بای بیرچوونەوە نەیبردن!

**خۆ هەموو گەرووەکان زێڕین نین.**
**هەموو هەناسەکان ئابن بە کزەبا و شەماڵ!**
**هەموو چریکەکان لە لوتکەیەکدا باڵ ناگرن.**
**خۆ هەموو دەنگەکانیش دەنگی کەریم کابان نین**
**ئەمە هەر قسەی من نییە**
**قسەی تاقگە و قەڵبزەکانیشە.**
**قسەی وژەوژ و گفەگفی نێو دارستانەکانیشە.**
**خۆ من هەر تاقە گوێچکەی شایەت نیم.**
**زەمان خۆی گوێچکە شایەتی هەرە گەورەی ڕۆژژمێرمانە!**
**کەریم کابان**

**پیاوێك لە بنەماڵەی ڕێحانەی دەنگی خۆش!**
**کاتێ دەنگی خۆش ئەبێ بە گمە و**
**گمەیش ئەبێ بە باڵ و بە پەیام بۆ ژیان.**
**کەریم کابان**
**ڕووبارێك لە ئاوازی زیوین**
**وەختێ ئاواز بە لووزە و ئەڕژێتە گیانمانەوە و**
**گیان ئەبێ بە دەریاچە و**
**گوێچکەیش بە چارۆگەی**
**مەقام و بەستەی جاویدان.**
**ئەمە ڕۆژی ڕێزلێنانە لە باڵا ئاوێنەیەکی جوان**
**کە وڵاتێ لەبەر ئەودا تەماشای خۆی ئەکات!**
**ئەمە ڕۆژی ڕێزلێنانە...لەو بارانی خۆشەویستییەی**
**کە لە دەمێکەوە**
**بەخشندانە بەسەرماندا دائەکەن.**
**ئەمە ڕۆژی ڕێزلێنانە**
**لەو شمشاڵ و باڵەبانەی**
**نیو سەدە زیاترە ئاوات و ئازارەکانمان لێئەدات!**
**تەمەنی درێژ بۆ ئەم کەمانچەیە.**
**بۆ ئەو ژێیانەی هەتا ئێستا**
**لە خۆشەویستیمان بۆ ئەژەنن و**
**بۆ ئەو گەرووەی هێشتا**
**گوڵی دەنگ ئەگرێ و**
**بەردەوام پۆلە نەغمەی**
**ڕەنگاوڕەنگی تیا ئەفڕێ و**
**تەمەنی درێژ بۆ ئەو عەشقەی**
**دوای مردنیش...هەر نامرێ!**

# کەریم کابان

**سەڵاح ڕەئوف**

سەرەتای ئاشنابوونم بە تیپی مۆسیقای سلەیمانی ئەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای دەستپێکردنی ساڵی خوێندنی ١٩٦٨-١٩٦٩ لە ڕێی مامۆستای ئازیز و گەورەهونەرمەندی کورد، مامۆستا ولیەم یۆحەنا. ئەو ساتە تیپی مۆسیقا و نواندن بەیەکەوە بوون و لە بارەگای ئێستای تیپی نواندن بوون. بەو هۆیەوە ئاشنایەتیم لەگەڵ سەرتاپای ئەندامان و لایەنگیرانی تیپی مۆسیقای سلەیمانی پەیدا کرد. لە ناو گۆرانیبێژانیشدا دۆستایەتیم لەگەڵ کەسانی وەکو ڕۆحیان شاد بێت (ئیبراهیمی خەیات و قادر کابان) و چەندی تریش پەیدا کرد، بەتایبەتی ئەو دووانەی کە ناوم هێنان، خاوەنی ستایلی تایبەتی خۆیان بوون. ڕۆحی شاد ئیبراهیم خەیات خۆی ئاوازدانەری خۆی بوو، ئاوازەکانی تاموچێژ و تایبەتمەندییەکی تایبەتی خۆی هەبوو، هەروەها قادر کابان ڕۆحی شاد ئەویش خاوەنی مۆرک و ستایلێکی تایبەت بوو، بۆیە زۆرجار لێم ئەپرسی ئایا خۆی ئاواز دائەنێ یان کەسێکی دیاریکراو ئاوازی بۆ دائەنێ، لە وەڵامدا ڕۆحی

شاد قادر کابان ئەیوت خۆم زۆر خەریکم، بەڵام گەورەترین پاڵپشتم کاک کەریمی برامە، مەبەستی کەریم کابان بوو.

ڕۆژ بە ڕۆژ ئاوازەکان و چڕینەکەیم بە دڵدا ئەچوو. هەردەم ئەمویست لاسایی ئەو جۆرە ستایڵەی قادر کابان بکەمەوە، چونکە لە قاڵبی فۆلکلۆری دەرچووبوو، مۆرکی تازەگەریی زۆر پێوە دیار بوو، هەستم ئەکرد ئەو جۆرە ستایڵە پاشەڕۆژێکی جوانی بۆ هونەری نەتەوەکەم ئەبێت. بۆیە تا ئێستاش شانازی بەو جۆرە ستایڵەوە ئەکەم.

ڕۆژ و مانگ و ساڵ ڕۆیشت، ساڵی ٧٤ پاش یەک مانگ دوای چوونمە ژیانی هاوسەرگیری، ڕۆژێک برای ئازیزم کاک فەریدون دارتاش وەکو سەرۆکی تیپی مۆسیقای سلەیمانی هات بۆ لام و پێی وتم کە من یەکێکم لەو کەسانەی دەشێ وەک ئەندامێکی تیپی مۆسیقای سلەیمانی بچینە نێو ڕیزەکانی شۆڕش. زۆرم پێ خۆش بوو کە لەگەڵ هەندێ لە ئەندامانی تیپی مۆسیقای سلەیمانی

وەکو هەموو کەسانێکی نەتەوەخواز شانبەشانی تێکۆشەرانی وڵاتەکەم ڕوو دەکەینە شاخ دژ بە ڕژێمی لەناوچووی بەعس، کە دژ بە نەتەوەکەمان، بانگەشەی شەڕ و لەناوبردنی نەتەوەکەمانی ڕاگەیاند. لەگەڵ چەند ئەندامێکی تیپەکەم بەڕێ کەوتین. ئەو ڕۆژە گەیشتینە ناوچەی چوارتا و هەر لەوێ لەگەڵ چەند برادەرێکی تیپ یەکمان گرتەوە. ڕۆژێک دوای ئەوە بەڕێ کەوتین بەرەو شارێ ڕانیە و پاشان قەڵادزێ، لەوێش ڕۆژێک ماینەوە و چەند برادەرێکی تیپمان بینی، دوای ڕۆژێکی تر پێکەوە بەڕێ کەوتین بەرەو شاری ڕانیە و پاشان ناوچەی بالیسان، هەر ئەو ئێوارەیە بە هۆی ڕادیۆی دەنگی کوردستانەوە هەواڵی بۆردمانی شاری قەڵادزێمان بیست، پاش چەند ڕۆژێک گەیشتینە ناوچەی گەڵاڵە، پاشان بەرەو حاجی هۆمەران، لەوێ ماینەوە تا شوێنمان بۆ دیاری کرا. دواتر بەرەو دێی (وەسان) بەڕێ کەوتین. هەر ئەو ساتە هەندێ لە ئەندامانی تیپەکەمان شانبەشانی هەندێ لە هونەرمەندانی

کۆیە و ڕەواندز و هەولێر و دهۆک و زاخۆ و چەند جێگەیەکی تری کوردستان بنکەیەکمان بۆ خۆمان دروست کرد، دەستمان کرد بە خەباتی هونەری، تۆمارکردنی سروودی نەتەوەیی بۆ ڕادیۆی دەنگی کوردستان. خۆمان ئامێرە مۆسیقاییەکانمان ئەژەند و دەشبووینە کۆرس و بێژەری سروودەکان، لەبەر ئەوەی دەنگبێژی کەممان لەگەڵ بوو.

بە داخەوە، هەندێ لە ئەندامانی تیپەکەمان بە هۆکاری تایبەتی بۆ شاری سلەیمانی گەڕانەوە. هەروەها لەناکاو بە هۆی باری نەگونجاو و ئەو بارودۆخەی کە دانیشتوانی شارەکانی کوردستانی تێکەوت (بە هۆی دەرکردنی زۆربەی خێزانەکانی ئەو کەسانەی کە لە ڕیزەکانی پێشمەرگە بوون بەرەو دەرەوەی شارەکان،) هەندێ گرفتی تری تایبەتی لە ناو تیپەکە دروست بوو. هەندێک لە ئەندامەکانمان لەو گروپە گەورەیە دوور کەوتنەوە و گەڕانەوە بەرەو لای خێزانەکانی خۆیان، کە لە کوردستانی ئێران بە شێوەی ئاوارە ژیانیان بەسەر ئەبرد.

ماوەی چەند مانگێکمان بەسەر برد، بەڵام ئێمە هەر بەردەوام بووین لە تۆمارکردنی سروود و هەروەها گێڕانی چەند ئاهەنگێک لە بنکە جیاوازەکانی ناوچەی باڵەکایەتی. زۆر لە وەفدە بیانییەکان و هونەرمەندەکانی تری میلەتەکەمان سەردانی بارەگاکەی ئێمەیان ئەکرد، هەندێ جار لەوێش ئاهەنگمان بۆ ئەگێڕان، ڕۆژێک لە سەرەتاکانی هاوینی ئەو ساڵە میوانێکی زۆر ئازیز هاتە لامان، زۆر دڵخۆش بووم کە بۆ یەکەم جار شاد بووم بە بینینی ئەو هونەرمەندە بەتوانا و دەنگخۆش و ئاوازدانەرە، پاش نزیکبوونەوەیەکی زۆر

لەو کەسە خۆشەویستە، پێشنیازی ئەوەی کرد کە چەند گۆرانییەکمان لەگەڵ تۆمار بکا، ئەوە بوو من نۆتەی هەردوو گۆرانییەکەیم بۆ نووسییەوە و دەستم کرد بە ئامادەکردنی مۆسیقا بۆ ئاوازی (شەو). تا ئێستاش ئەو نۆتانە لە نێو کتێب و ئەرشیفی هونەریمدا ماون. گۆرانییەکەی تری کەسێکی تر لە ئەندامانی تیپی مۆسیقاکەمان بۆی ئامادە کرد، هەرچەندە ژمارەی ژەنیارانی ئەو تۆمارکردنانە زۆر کەم بووین، بەڵام بۆ ئەو بارودۆخەی ئەو ساتانە کارێکی جوان دەرچوون. لە دوای هەرەس هەمان دوو گۆرانیمان لە ئاهەنگێکدا لە سەر شانۆی چالاکیی قوتابخانەکانی سلەیمانی لە گەڕەکی سەرکارێز دووبارە کردەوە. پاش ماوەیەک لە ستۆدیۆی تیپی مۆسیقای سلەیمانی هەمان دوو گۆرانیمان تۆمار کردەوە، بەڵام ئەم جارە ئامادەکردنی مۆسیقاکەی خرایە پاڵ کەسێکی تر، بەڵام من لەبەر ئەوەی بایەخ بە کاری ئامادەکردن نادەم و هەرگیز بە کاری خۆمیان نازانم، بۆیە گوێم پێنەدا، بە شتێکی بایەخدارم نەزانی، بەڵام بۆ بەرپەرچی نووسینی هونەرمەندێک کە ئامادەکردنی هەردوو ئاوازەکەی بە ناوی خۆی ناوزەند کرد، لە ساتی ڕێزلێنان لە هونەرمەند کەریم کابان، بۆیە منیش لێی نەوەستام و بە تەواوی وەڵامم دایەوە و لە لاپەڕەکانی کوردستانی نوێ، بەشی ئەدەب و هونەر بڵاوم کردەوە.

تا دەهات، کارەکانی هونەرمەندی گۆرانیبێژ لە ناخمدا جێی خۆیان ئەکردەوە، بۆیە دووبارە لەگەڵ تیپی مۆسیقای سلەیمانی کارێکی ترم بۆ ئامادە کرد بە ناوی (خەنەبەندان)، لە ئاوازە جوانەکانی خۆی و منیش مۆسیقایەکم بۆ ئامادە کرد، بەڵام لە ساتی پیشاندانی ئەو بەرهەمە بە لیژنەی هونەریی تیپی مۆسیقای سلەیمانی، کەسێک ڕای وابوو کە مۆسیقای پێشەکییەکەی تۆزێ خاوە لەگەڵ ئاوازەکەدا، من نەمزانی

هۆکارەکە چی بوو، هەرچەندە زۆر بە ئاسانی ئاشکرا بوو، بۆیە برای هونەرمەندم کاک ئەلبێرت عیسا وتی من پیاچوونەوەیەک بەو پێشەکییە مۆسیقییەدا ئەکەم، منیش لام ئاسایی بوو، ئەو ساتەی کە پێشەکیی مۆسیقاکە تەواو بوو، لەگەڵ سەرانسەری مۆسیقاکەی مندا ئەگونجا و وام ئەزانی کە هەمووی زادەی مێشکی خۆمن، بۆیە لای خۆمەوە ئەموت پێم خۆشە لەگەڵ برادەرێکی ترمدا هەمان ئەندێشەمان بۆ مۆسیقایەک هەیە، لەو سەردەمەدا برادەرێکم بازرگان بوو ڕۆحی شاد بێت، هاتوچۆی کوێت و ئینگلتەرای ئەکرد، چەند پەرتوکێکی مۆسیقایی بۆ هێنام، بەتایبەتی چوارینەکانی (مۆتزارت)، زۆر خۆشحاڵ بووم. ڕۆژانە پرۆڤەم لەسەر ئەکردن، ڕۆژێک لە ساتی پرۆڤەکردنم لە سەر یەکێک لە چوارینەکانی مۆتزارت سەیرم کرد هەمان ئەو چەند بارە مۆسیقایەیە، کە خراوەتە سەر ئەو مۆسیقایەی کە من بۆ خەنەبەندانم داناوە. وتم هەی، تۆ بڵێی من خەو ببینم، لە ساتی بەراوردکردنی ئەو چەند بارەی کە خرابووە سەر ئامادەکردنەکەی من کە بۆ خەنەبەندانم دانابوو، لەگەڵ مۆسیقاکەی مۆتزارت هیچ جیاوازییەکیان نەبوو، بەڵام من لێی بێدەنگ بووم، چونکە پێم خۆش بوو کە چەند بارە مۆسیقایەکی من شانبەشانی چەن بارە مۆسیقایەکی گەورە مۆسیقاری جیهانی مۆتزارت ئەگونجێ، بە ئاسانی بەسەر لیژنەی هونەریی تیپدا تێپەڕ بوو، بەڵام پاش تۆمارکردنی، هەندێ برادەری تیپ ڕاستییەکانیان بۆ دەرکەوت، منیش هەر بە پێکەنین وەڵامم ئەدانەوە، تا ئێستاش هەر بەو جۆرە ماوەتەوە. گوێگر و بینەرێکی زۆری هەیە و بە یەکێک لە کارە جوانەکانی گۆرانیبێژ کەریم کابان هەژمار ئەکرێ.

تا ئەهات، دۆستایەتی من و هونەرمەند کەریم کابان نزیک و پتەوتر ئەبوو، زۆر جار ئەهات بۆ شوێنی پرۆڤەکردنی تیپە مۆسیقایەکەی خۆم، کە لە ساڵی ١٩٧٧وە لە قوتابیانی قوتابخانەکانی پیرەمێرد و مەحویی کوڕان و خەبات و گۆیژەی کچان دروستم کردبوو لەژێر ناوی (تیپی مۆسیقای پیرەمێرد)، دەیان گۆرانیی منداڵان و ئۆپەرێت و کاری هونەریی بەسۆزمان خستە ناو ئەرشیفی هونەریی نەتەوەکەمان. لە ناوەندی ساڵی هەشتاکاندا، ئەو ساتانەی تیپەکەمان (تیپی مۆسیقای پیرەمێرد)، لە هەوارگەی دایەنگای (ڕەوزە) خۆماڵی پرۆڤەی ڕۆژانەمان ئەکرد، ڕۆژێک هات بۆ لامان و وتی ئاوازێکی نوێم داناوە، لە هۆنراوەی دکتۆر فەرەیدون عەبدول بەرزنجییە، پێم خۆشە گوێی لێبگری، منیش زۆرم پێ خۆش بوو، کە لە چرینی ئاوازەکە بووەوە، دەستخۆشییم لێکرد، وتی ئاخر ئەبێ بۆم ئامادە بکەیت، منیش وتم بان چاو، بەڵام ئەم جارە بە تیپی

هونەرمەندانی شاخ ساڵی ١٩٧٤

مۆسیقای سلەیمانی نا، بەڵکو بە بەهرەدارەکانی تیپی پیرەمێرد تۆماری ئەکەین، زۆری لا باش بوو، بە تۆمارکەرە دەستییەکەی خۆم بۆم تۆمار کرد، تاکو لە دەرفەتێکدا دەست بکەم بە نووسینەوەی نۆتەکەی و خەریکی بنیاتنانی مۆسیقایەکی گونجاو بم بۆی. پاش ماوەیەک، مۆسیقایەکی گونجاوم بۆ ئامادە کرد و کاری دابەشکردنی هارمۆنی و ئامێریشیم ئەنجام دا. لەگەڵ بەهرەمەندەکانی تیپی مۆسیقای پیرەمێرد، بەبێ کاک کەریم کابان، دەستمان کرد بە پرۆڤەکردن. پاش چەندین ڕۆژی پرۆڤە، ڕۆژێک لە پەیمانگای هونەرە جوانەکان، کە ئەو ساتانە من مامۆستای بەشی مۆسیقا بووم و بەڕێزیشی فەرمانبەر بوو، پێم وت کە خۆی ئامادە بکا بۆ ئەوەی لەگەڵ تیپدا پرۆڤە بکات. زۆری پێ خۆش بوو و وتی؛ تەواوت کردووە؟ منیش وتم پرۆڤەی تەواویشمان تێدا کردووە. هەر هەمان ڕۆژ لە دوای کاتژمێر سێی پاشنیوەڕۆ لە ڕەوزەی خۆماڵی دەستمان کرد بە پرۆڤە، بە چەند ڕۆژێکی پرۆڤە بە تەواوی ئامادەمان کرد بۆ تۆمارکردن، پاشان لە تۆمارگاکەی تیپی مۆسیقای سلەیمانی تۆمارمان کرد. کارێکی زۆر جوان و بەپێز دەرچوو، لەگەڵ چەند بەرهەمێکی تری تیپی مۆسیقای پیرەمێرد لە تەلەفزیۆنی کەرکوک تۆمارمان کرد، تا ئێستاش لە تەلەفزیۆنەکانی کوردستان لێئەدرێت و ڕەواجێکی باشی هەیە.

پاش ماوەیەکی تر، دکتۆر فەرەیدون عەبدول بەرزنجی هۆنراوەیەکی زۆر گونجاوی بۆ هێنام بە ناوی (خاتووزین). ناوەڕۆکی هۆنراوەکە زۆر جوان و پڕمانا بوو، لە ماوەیەکی کورتدا کردمە ئاواز، لەبەر ئەوەی ئەوەندە لە بیر و بۆچوونە هونەرییەکانی خاڵە کەریم ئاشنا بووبوم، لەسەر ڕێچکەی ئاوازدانانەکانی ئەو دامنابوو، ڕۆژێک لە پەیمانگا بە کاک کەریمم وت کە هۆنراوەیەکی دکتۆر فەریدون بەرزنجیم بە ناوی (خاتووزین) کردووەتە ئاواز و بەنیازم بیدەمێ، ئەشمزانی کە تا ئەو ساتانە کەس ئاوازی بۆ دانەنابوو، بەڵکو ئەوە یەکەم ئاوازە کە لە کەسێکی تر

وەری بگرێ، ئەو ئاوازانەی کە لەوەوبەر لە ڕادیۆی کوردیی بەغا و لە هەر شوێنێکی تر چڕیبێتی، ئاوازەکان فۆلکلۆری بووە یان ئاوازی خۆی بووە، کەواتە ئاوازی خاتووزین بووە یەکەم ئاواز، کە لە ئاوزدانەرێکی تر وەری بگرێ، زۆر بە خۆشحاڵییەوە دەستمان کرد بە پرۆڤەکردن و پاش ماوەیەک دووبارە لەگەڵ تیپی مۆسیقای پیرەمێرد تۆمارمان کرد. پاش ڕاپەڕین بە کامیرای تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان تۆمارمان کرد، تا ئێستاش هەر کەسێ گوێی لەو ئاوازە ئەبێ، وا ئەزانێ یەکێکە لە ئاوازە دانراوەکانی هونەرمەند کەریم کابان.

هۆڵەندا- ٢٠١٥

# هونەرمەندی گۆرانیبێژی ڕەسەن
# کەریم کابان

**نووسینی: وریا ئەحمەد**

«ساڵانی (1945 ـ 1946)، لە (ئێستگەی بەغدا، بەشی کوردی) بووم، ڕۆژانی هەینی کاتژمێر (5:30) پاش نیوەڕۆ ئاهەنگی گۆرانیی ئاڕاستەییم پێشکەش ئەکرد، ئەو کاتە مامۆستا (جەمیل بەشیر) و (مونیر بەشیر) لە ئێستگە بوون. جارجار لە کاتی چوونما بۆ ئێستگە ئەو کوردانەی لە بەغدا بوون و حەزیان لە گۆرانی و موزیک بوو، لەو چاخانەیەی نزیک ئێستگە دائەنیشتن چاوەڕێی چوونی ئێمەیان ئەکرد بۆ ئێستگە، کە چاویان پێمان ئەکەوت، داوایان ئەکرد فڵان گۆرانییان بۆ بڵێین، بە نیسبەت خۆمەوە بێدڵێم نەئەکردن و چییان بویستایە، بۆم ئەگوتن. جا گۆرانی داواکراوی ئەو کاتەش بەو جۆرە بوو»1.

١ بڕوانە گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە (٥٤)ی ئاداری ساڵی (١٩٧٩) ل. (٦١). شایانی باسە ئەو ساڵانەی (سەرنووسەری گۆڤاری چلاواز) بووم، لەبەر خۆشویستنی هونەرمەند (کەریم کابان) ئەو نووسینەی گۆڤاری (بەیان)م جارێکی دی لە گۆڤاری (چلاواز)ی ژمارە (٤٧)ی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠١٠)دا ل. (٢٧) لەژێر ناونیشانی (چەند سەربردەیەک) جارێکی دی بڵاو کردەوە.

(ڕەنگە ئەوەی ئێستا باسی لێوە دەکەم، ناوەڕاستی پەنجاکانی سەدەی پێشوو بووبێت)، لە بیرمە ئەوسا لە ماڵی (حەمە مەلا)ی باپیرم (رادیۆ) یەکی گەورە هەبوو، بەقەد هەندێ لە تەلەفزیۆنە ماماوەندییەکانی ئەمڕۆ دەبوو، جا هاوینان لەو هەیوانە گەورەیە دادەنرا. هەیوانەکەیش دووردرێژ بوو، پێچی خواردبووەوە و بەسەر حەوشە پانوبەرینەکەیدا دەنواڕی، حەوشەکە لەجیاتیی کاشی و مەڕمەڕی ئەمڕۆ، هەمووی بە (تاتەبەردی پان) داپۆشرابوو، حەوزێکی گەورەی تێدابوو، بۆرییەک لە ناوەڕاستیدا بوو، بەردەوام شڵپەی ئاوەکەی دەهاتە بەرگوێ، ئەو حەوزە لەجیاتیی (تانکی ئاوی) سەربانانی ئەمڕۆ بوو، ژنە هەژارەکانی دراوسێمان، ئەوانەی لە ماڵەوە بۆریی ئاویان نەبوو، دەهاتن و بە (پەقرەج) لەو حەوزە ئاویان دەبرد. جگە لەوە، حەوشەکە دارتوویەک و دارمێوێکیشی تێدابوو، ئێواران جگە لە خێزانی خۆمان، ئەوانەی لە ماڵی بابە گەورە دەژیان، بریتی بوون لە مامە کەریمم خۆی و مامۆژنم و (7) کوڕەکەی، چونکە تاقانە کچەکەی مێردی کردبوو، بابە گەورەم و دایە گەورەم و پلکە عەیشێی خوشکی باپیرم، من و دایکم، چونکە باوکم کەم جار لە ماڵەوە بووە، هەمیشە لەگەڵ هاوەڵانی بووە، بەدەم مەینۆشینەوە، خەریکی سیاسەت و کوردایەتی بوونە. جگە لە ئەندامانی ئەو ماڵە قەرەباڵغەی خۆمان، هەندێ لە دراوسێکانیشمان ئەوانەی ڕادیۆیان نەبوو، لەسەر ئەو هەیوانە لە دەوری ئەو ڕادیۆیە کۆ دەبوونەوە و گوێیان بۆ گۆرانی و شتی دی شل دەکرد. جوان گۆرانییەکان و گۆرانیبێژەکان لە یادم نەماون، ڕەنگە ئەوسا هونەرمەند کەریم کابانیش یەکێک لەوانە بووبێت، کە گوێمان بۆی ڕادێراوە.

زووتر، مەبەستم ئەوەیە بەر لەوەی کارەبامان بۆ بێت، ڕادیۆکە بە پاتریی ئۆتۆمبیل ئیشی دەکرد و دەبوو جارجارە پاترییەکە (پڕ بکرێتەوە)، مامم (کەریمی حەمە مەلا)، یادی بەخێر، مەکینەیەکی بچکۆلانەی بۆ ئەو مەبەستە لە بەغداوە بۆ کۆیە هێنابوو، خەڵک بۆ ماڵی بابە گەورەم دەهاتن و پاترییان لە لای مامم پڕ دەکردەوە، مەکینەکە دەنگێکی گەورەی هەبوو، دووکەڵێکی ڕەشیشی لێ هەڵدەستا، هەندێک جاریش خاوەن پاترییەکان و مامم دەبوو بە هەرایان، لەسەر ئەوەی گوایە: مامم پاترییەکەیانی باش پڕ نەکردووەتەوە! دیارە سەرەتای دامەزراندنی ئێستگەی کوردی بەغدا، گۆرانیبێژان ڕاستەوخۆ گۆرانییان تیایدا پێشکەش کردووە و جارێ هێشتا تۆمارکردنی گۆرانی نەبووە، بەڵام دواتر تۆمارکردن پەیدا بووە و ئیتر گۆرانیبێژان گۆرانییەکانیان بۆ ئێستگە تۆمار کردووە. هەر کاتێک ئێستگە مەبەستی بووبێت، ئەو بەرهەمە تۆمارکراوانەی بڵاو کردووەتەوە. موزیکژەنانی ئەو سەردەمانە کورد نەبوونە، نەک هەر ئەوە، بگرە زۆربەیان کوێریش بوونە. بەڵام نابێ نکۆڵی لەو ڕاستییە بکرێت، کە موزیکی ئەوان و تۆمارکردنی گۆرانیی هونەرمەندانی وەک کەریم کابان و دەنگبێژەکانی دی، کاردانەوەی ئەرێنیان لەسەر پێشکەوتنی ڕۆژ دوای ڕۆژی هونەری گۆرانی و موزیکی کوردیمان هەبووە و گەشەیشیان بە بەهرەی هونەریی دەیان بەهرەمەندی وەکو بەندە داوە. گۆرانییەکانی ئەوسای هونەرمەند کەریم کابان، ئەوانەی وەبیرم ماون، (بەری بەیانە زرەی فنجانە) و هی دیکە بوون.

لە کۆتاییەکانی مانگی شوباتی ساڵی (1974)، یەکەمین میهرەگانی هونەری کوردی لە بەغدا ساز کرا2، تیپەکانی مۆسیقا و نواندن و هونەرمەندانی

2 میهرەگان، هونەرمەند (مەزهەر خالقی) باسی ئەو وشەیەی بەو جۆرە بۆ کردم و گوتی، «لە جەژنی (میهرەگان)، کە جەژنێکی زۆر گرنگە، گۆرانیم گوت، لە ئایینی پەیامبەر (زەردەشت)دا مانگەکان هەر یەکە و بۆنەیەکیان هەیە، مانگی (میهرەگان)، مانگێکە هەموو ساڵێک بە خۆشی و شادی بەسەر میللەتدا تێپەڕ ئەبێت.» هەروەها گوتی، «پێم وایە هەر ئەو وشەی (میهرەگان)ی ئێمەیشە، عەرەبەکان کردوویانە بە (میهرەجان).... هتد».
شایانی باسە گەلێ جاریش مامۆستای شوێنەوارناس (عەبدولڕەقیب یوسف)، ئامۆژگاری کردووین، کە بۆ لێرەودوا لەجیاتیی وشەی (فێستیڤاڵ) زاراوەی سەر بە ئایینی (زەردەشتی) دێرینی کوردان (میهرەگان) بەکار بهێنین.

دی لەو میهرەگانە بەشدار بوون و بە ئەنجامی باشیش دەرچوون. ئەوە بوو کاتێک لە بەغداوە بەرەو شارەکانی خۆمان گەڕاینەوە، ئەوەندەی نەبرد ڕژێمی (بەعس)ی لەناوچوو، جارێکی دی شەڕی بە گەلەکەمان فرۆشتەوە، ئێمەی ئەندامانی (تیپی مۆسیقای باواجی کۆیە) و (تیپی مۆسیقای سلێمانی) و...هتد، وەک زۆربەی خەڵکی ڕۆشنبیر و نیشتمانپەروەر، چووینە ڕیزی شۆڕشی ئەیلوولەوە. شایانی باسە لە ناوچە ئازادکراوەکان، هونەرمەندانی ئەندامانی گشت تیپەکانی موزیکی شارەکانی کوردستان (تیپی مۆسیقای شۆڕش)مان دروست کرد و بارەگای تیپەکەمان لە گوندی (وەسان)ی دۆڵی (باڵەییان) بوو، لێرە لەبن باری بۆردوومانی قورسی فڕۆکە جەنگییەکانی دوژمن، ڕۆژ بووە دوو سروودمان بۆ (ئێستگەی دەنگی کوردستانی عیراق) تۆمار کردووە و ورەمان بە پێشمەرگە گیانلەسەردەستەکان داوە و لە شەڕی بەرگرییاندا لە خاک و گەلی کوردستان بەرامبەر دوژمنی سەرسەختی خاوەن دەیان جۆر چەکی قورس و پێشکەوتوو، ئەوسا سروودەکانمان ڕۆڵی ئەرێنیی خۆیان لەسەر ورەی پێشمەرگە بینی، جاریش بووە لەبەر دڕندەیی بۆردوومانی تۆپ و فڕۆکەکانی دوژمن و ڕاکردن بۆ ناو حەشارگە، لە هەفتەیەکدا نەمانتوانیووە تەنیا سروودێکیش چییە، تۆمار بکەین. دۆڵی باڵەییان کە وەک بەهەشتی سەرزەمینە و مرۆڤ نازانێت سەیری شاخەکان بکات، کە زۆربەی وەرزی ساڵ بە بەفر داپۆشراون یا سەیری دیمەنی دار و بار و ڕووباری خوڕی ساردی وەک بەفراوی بکات، مرۆڤ سەرسام دەبێت و دۆش دادەمێنێت لەوەی سەیری کوێی بکات. لەو بەهەشتە کە بارەگای ئێمەی لێبوو، جارجارە گۆرانیبێژان بە مەبەستی سەردانکردنمان بوایە یان بە مەبەستی تۆمارکردنی گۆرانی و سروود، دەهاتن. کۆچکردوو مام ڕەسوڵ گەردی یەکێک بوو لەو هونەرمەندانەی مانگانە سەردانی دەکردین. لە یەکەمین سەردانی بۆ لامان، ئێمەی گەنجی دەستوپێ سپی، نزیکەی شەش مانگ دەبوو لەو شوێنە بووین و ڕۆژانە برنجمان بە کوڵاوی دەخوارد. ئەو ڕۆژەی مام ڕەسوڵ هات، گوتی:

«مادام ئەوەندە لە برنج بێزارن ئەمڕۆ (نیسک) تان بۆ لێدەنێم.» ئەوەندەم زانی، بۆنی خواردنێکی زۆر خۆش هات، خواردنی دایکمی وەبیر هێنامەوە، خێرا لە مام ڕەسوڵ چوومە پێش و برادەرانیش هەر وەک من دەوریان دا، گوتم: «ئەرێ مامە گیان ئەو بۆنە خۆشە چییە؟» تووڕە بوو گوتی، «کوڕە هەی ماڵت بە قوڕ نەگیرێ، ئەوە جارێ تەنیا پیاز و ڕۆن داغ دەکەم!"

گریانم بۆ خۆمان هات، ئەو هەموو ماوە دوور و درێژە لێرەین، کەچی نەمانزانیوە بۆ خواردن و چێشتلێنان پیاز و ڕۆنێک داغ بکەین!

یەکێک لەو جارانە هونەرمەند کەریم کابان بۆ لامان هات، ڕۆژی دواتر دوو نۆتەی دوو گۆرانیمان بۆ هات، ئەوانیش نۆتەی گۆرانی (یاران وەسیەتم) و گۆرانی (شەو) بوون. ئەوەم قەت لە بیر ناچێت لە گۆرانی (یاران وەسیەتم) سۆڵۆیەک بەمن درابوو، کە ئەوسا بە ئامێری (جومبوش) ژەندم، هونەرمەند کەریم کابان کەسێکی گەلێک دەموزار شیرین بوو، زۆر دڵی بەو سۆڵۆیەی من خۆش بوو، هەر جارێک دەیدیتم، دەیگوت «وریا گیان دەزانی ئەو سۆڵۆیەت زۆر شیرین ژەنیووە.» ئەو کەسانەی ئەو ساڵە پێشمەرگە بوون، دەزانن کە ئەو دوو گۆرانییەی هونەرمەند کەریم کابان، یەکەم جار لە ناوچە ئازادکراوەکان دەنگیان دایەوە و بە گوێی خەڵکی پێشمەرگە و هەم ئاوارەکان تا ڕادەیەکی زۆر ئاشنا بوو، دوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلوول لە ڕێگەی هونەرمەند (عومەر سەرکار)ەوە، زانیم کە (تیپی مۆسیقای سلێمانی) بە نیازە ئەم جارە ئەو دوو گۆرانییە بۆ ئێستگە و تەلەفزیۆن تۆمار بکەن و ئەو سۆڵۆیەی گۆرانی (یاران وەسیەتم)یش هەر بە من بدەن و بە ئامێری (جومبوش) وەک ئەوەی ناوچە ئازادکراوەکان جارێکی دی بیژەنمەوە. لە ڕاستیدا بەو قسەیە زۆر دڵخۆش بووم، خۆ ئێمە لە (تیپی مۆسیقای باواجی کۆیە)، زووتر کاری لەو جۆرەمان کردبوو، زۆربەی جار بە دوای هونەرمەند (شەوکەت ڕەشید)ماندا ناردووە، لە کەرکووکەوە هاتووە و وەک ئەندامێکی تیپەکە لە نێومان دانیشتووە. گۆرانیبێژانی کۆچکردوو (ئیبراهیم خەیات) و (تەحسین تەها) و (فوئاد ئەحمەد) و (تایەر تۆفیق)ی نەمرمان بۆ ئاهەنگەکانی ساڵانەی تیپەکە داوەت کردووە، کەچی مخابن دواجار زانیمەوە کە من لە چاوەڕوانی (گۆدۆ)دا بوومە و گۆرانییەکەیان تۆمار کردووە و سۆڵۆیەکەی من، بە ئامێری (کەمان) درابوو، بەڵام نەک لەبەر ئەوەی من ئەو سۆڵۆیەم نەژەنیبوو، هەستم کرد ئەو سۆڵۆیە تاموچێژی خۆی دۆڕاندبوو، دیارە دیارنەمانی سۆڵۆی جومبوشەکە کاریگەریی نەرێنی لەسەر ئەو گۆرانییەش جێ هێڵابوو. ئەو سۆڵۆیەی من بە ئامێری جومبوش زووتر بۆ ئەو گۆرانییەم لێدابوو، بڕوا بکەن درەوشاوەیی و ڕەونەقی زۆری بەو گۆرانییە بەخشیبوو.

هونەرمەند کەریم کابان منی خۆش دەویست و جارجارە بۆم دەدوا و بۆی دەگێڕامەوە و دەیگوت کاتی خۆی لەم ناوچانە، ئەگەر لە بیرم مابێت، مەبەستی لە ناوچەی بارزان و بلێ و ئاکرێ و ئەو شوێنانە بوو، لێرە پلەی وەک (عەریف) یان گەورەتری پۆلیسی بێتەلی هەبووە، لەسەر ئامێری (بێتەل) کارمەند بووە، بۆیە سەیرم دەکرد لە قسە و دیالێکتی ناوچەکەیش وەک برادەرانی دیکەی ناوچەی سلێمانی، هونەرمەند کەریم کابان گرفتی تێگەیشتنی لە دیالێکتی ناوچەکە نەبوو.

# دەنگخۆشیی و هونەری دەنگیی (کەریم کابان)

نووسینی: خالید سەرکار

دەنگی مرۆڤ، بەتایبەت دەنگخۆش و بە ئیحساس، دەنگێک کە کاریگەریی لەسەر ناخی مرۆڤ هەبێت و دەروونی بهەژێنێت، دونیای جوانیی بۆ والاّ بکات، ناخی پاک و ڕوون دەکاتەوە لە هەموو کینە و بوغزێک، ئەم جۆرە دەنگە لە مرۆڤەکاندا لە نیعمەتە جوانەکانی خوای گەورەیە، کە بەخشیویەتی بە هەندێک مرۆڤ و هەندێکی تر نیەتی، ناکرێت و نابێت هیچ دەنگێک سەد دەر سەد لە دەنگێکی تر بچێت، ئەکرێت بە شێوەیەک لە شێوەکان لەیەک بچن یا تا ڕادەیەک نزیک ببنەوە. خۆشبوونی دەنگ یا جوانیی دەنگ چ بە ڕاهێنانی دەنگی و چ بە گۆرانیوتنی زۆر دروست نابێت، بەڵکو ئەم بەهرە و توانایە خۆڕسکە و لەگەڵ دروستبوونی مرۆڤدا پەیدا بووە... بێگومان ئەکرێت دەنگیی خۆش و باش بە ڕاهێنانی زانستی

موزیکی باشتر و باشتر بکرێت تا جوانترین و باشترین ئەدا بکات. بەڵام هیچ ڕاهێنانێک دەنگی ناساز و ناخۆش ناکات بە دەنگێکی خۆش و پڕ سۆز و پڕ ئیحساس گەر ئەو هیبەیە یا ئەو نیعمەتە خوا پێی نەبەخشیبێت.
دەنگخۆشی لای هونەرمەند (کەریم کابان) ئەم ڕاستییە دەسەلمێنێت، کە دەنگێکی جوان و خۆش و پڕ ئیحساسە، هەستی گوێگر دەبزوێنێت و دەیباتە ناو جوانیی خەیاڵ و لە ناخیدا جێگیر دەبێت.
دەنگی ئەم هونەرمەندە یەکێکە لەو دەنگە دەگمەنانەی کە مێژووی موزیک و گۆرانیوتن ڕەنگە لە سەدەیەکدا تەنها دەنگێک دروست بکات، کە مێژووی ئەم هونەرە ئەم ڕاستییەی دیاری کردووە. زۆر زۆرن ئەو کەسانەی گۆرانی دەڵێن، بەڵام کەمن ئەو دەنگانەی جێگەی خۆیان دەکەنەوە، بوونی خۆیان ئەسەلمێنن و دەمێننەوە، دەنگی هەموو زەمان و کاتەکانن و لە دەروونی ئینسانەکاندا جێگەی خۆیان هەیە.
کەریم کابان خاوەنی دەنگێکی کوردیی ڕەسەنە، هەڵقوڵاوی شارە جوانەکەی سلێمانییە. هەموو ئەو سیفەتە جوانانەی باسم کردن، لە دەنگیدا بەدی دەکرێن و هەستیان پێدەکرێت، دەنگێکی مێژووییە و لە خانەی مێژوودا جێگەی هەیە، کە دووبارە نابێتەوە.
کەریم کابان لە ڕووی زانستی موزیک و دەنگەوە هیچ زانییەکی نەخوێندووە و هیچ ئوستادێک پەلی نەگرتووە و حەرفێکی فێر نەکردووە، کە خۆزگە وا نەبووایە، هەروا گۆرانیبێژە ڕەسەنەکانی میللەتەکەمان بەگشتی وابوون، دیارە دواکەوتوویی بواری ڕۆشنبیری و نەبوونی کیانێکی سەربەخۆ تا بەرجەستەی هەموو ئەم تایبەتمەندییانە بکات بۆ ئەم بوارە، ئەم کەلێنەی خستووەتە ناو هونەری گۆرانی و موزیک، گەر لە وڵاتێکی پێشکەوتوو بوایە، گومانم نییە زیاتر و زیاتر جێگەی خۆی دەکردەوە و باشتر و زانستییانەتر پەیامەکەی دەگەیاند. ئیتر تەنها بەهرە و سەلیقەی خۆڕسکی خۆی بووە.
بۆ وەدەرخستنی توانا و بەهرەی دەنگخۆشیی کەریم کابان، بنەماڵەکەی کاریگەر بوون، کە دەزانین دەنگخۆشێک لە بنەماڵە کاریگەریی ڕاستەوخۆی دەبێت لەسەر ژیانی هونەریی ئەو دەنگخۆشە، بنەماڵەکەیان چەندین دەنگخۆش و هونەرمەندی بواری موزیکیان تێدا هەڵکەوتووە، نموونەمان کە زیاتر دیار بێت، هونەرمەند (قادر کابان)ی برای و هونەرمەند (جەمال کابان)ی بەتوانا لە بواری ژەنینی ئامێرە ڕیتمییەکاندا.
دەنگی کەریم کابان خاوەن ستایلێکی تایبەتە لە گۆرانیوتن و گۆرانیی کوردیدا... لە هیچ دەنگێکی تر ناچێت، یا کاریگەریی هیچ دەنگێکی تری بەسەرەوە نییە، یا لاساییکردنەوەی دەنگێکی تر. تایبەتمەندیی شاری سلێمانیی زۆر پێوە دیارە، دەنگێکی بەتوانایە و پانتاییەکی فراوانی دەنگی هەیە، زیاتر لە ئۆکتاڤ و نیو توانای بەرجەستەکردنی تۆنە نزمەکان(Bass) و تۆنە بەرزەکانی لە (Tenor) دا هەیە...
زۆر بە باشی و زیرەکانە مامەڵە لەگەڵ وشە دەکات، جوانکاریی تێدا دەکات و سەرکەوتووانە ئەدای دەکات، زۆر بە جوانی میلۆدی و ڕستە موزیکییەکان دەگەیەنێتە گوێگر و قبوڵ دەکرێت... بۆیە دەتوانم بڵێم زۆرترین گوێگر و عاشقی دەنگیی هەیە لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا. زۆرینەی جەماوەرەکەی حەز و تاموچێژ لە دەنگی وەردەگرن و دەنگی کەریم کابانیان لا پەسەند و خۆشە. ئەم دیاردەیە لە گۆرانیی کوردیدا و گۆرانیبێژی تردا زۆر کەمە. ئیحساسێکی زۆر جوانی هەیە لە کاتی گۆرانیوتندا، ئەدای میلۆدی و وشە و هۆنراوە تێکەڵ بە ناخی دەبێت و بە سۆزێکی گەلەک جوان دەری دەبڕێت. یەکێکە لەو هونەرمەندە گۆرانیبێژانەی بە دەست و بە لەش و بە ڕووی جوانترین (تەعبیر) دەکات، ئیشارەتەکانی پڕ مانان، زۆر ڕاستگۆیانە تەعبیر لە ناخی دەکات، دوور لە ئیحساسی بێتام و کاڵوکرچ

و بێمانا. سۆزی دەنگی ئەم هونەرمەندە ئەمەندە بەجۆشوخرۆشە، دوای بیستنی گۆرانییەکانی ئەتباتە دونیای جوانیی هونەر و جوانیی خەیاڵ و ئەندێشە و جوانیی ئەداکردن، بە مانای وشە ئەتباتە دونیای (تەرەب)، کە زۆر کەمن ئەو دەنگانەی ئەم سیفەتانەیان تێدا بێت.

هەرچەندە ژمارەی گۆرانییەکانی لە چاو تەمەنی هونەرییدا کەمن، بەڵام پوختەن، شاکارن، نەمرن، بوونەتە سومبلی جوان لە گۆرانیی کوردیدا، کە دڵنیام شێوازی دەنگی کەریم کابان و ئەداکردنی دەبێتە قوتابخانەیەکی تایبەت بە ئەداکردن و دواڕۆژ، دوور بێت یا نزیک، کاری هونەریی گەورە و توێژینەوە و نووسین و شیتەڵکردنی زانستییانەی بەرهەمەکانی دەبنە کەرەسە و بابەت و ئەگەر لە پەیمانگە و کۆلیژە هونەرییەکاندا بخوێنرێت، خوێندکاران لێی سوودمەند بن، ئەو کاتە زیاتر جوانی و هونەری گۆرانییەکانی لای خەڵکی دەردەکەوێت، هێشتا لای ئێمە گۆران وتەنی: دیارە قەدری سنعەتکار لە ناو قەومی بەسیتا وەکو عەکسی قەمەر وایە لەناو حەوزێکی لیخندا!!

کەریم کابان، وەک ئیشارەتم پێدا، لە گۆرانییەکانیدا زۆر زیرەکانە مامەڵە لەگەڵ وشە و هۆنراوە دەکات. هۆی ئەمەش دەگەڕێنمەوە بۆ سەلیقە و کارامەیی خۆی، کە ئەم سیفەتە لە ناو زۆرینەی گۆرانیبێژاندا زۆر کەمە. زۆر بە سەلیقە و بە جوانی شیعر دەکات بۆ گۆرانی هەڵدەبژێرێت، شیعرێک دەستنیشان دەکات ئیحساسی بجووڵێنێت و کاریگەری لە ناخیدا دروست بکات، دیارە خۆی عاشقی شیعر و شاعیران بووە. وەک لە نزیکەوە دەزانم، زۆر لە شیعری شاعیرە ناودارە کلاسیکییە کوردەکانی لەبەر بووە، شیعرناسین یەکێکە لە سیفەتەکانی، زۆر جار لە مەجلیسی ئەدەبی و شیعر و گۆرانیدا گەر شیعرێک، بەتایبەت کلاسیک، بوترایە، هەر زوو کەریم کابان شاعیرەکەی دەناساند، زۆر حەزی لەوە بوو ئاواز بۆ هەموو شیعرەکە دابنێت و بە

گۆرانی ئەدای بکات بەبێ پچڕان و بەشبەشکردنی، یا ماوەی کاتی گۆرانییەکە درێژ بوو‌بێت، ڕای وابوو نابێت مانای شیعری ئەو قەسیدەیە تێک بچێت بە هەڵبژاردنی چەند بەیتێک لەو قەسیدەیە، بۆیە چەند گۆرانییەکانی دوورودرێژن، کەچی هەست بەو کاتە ناکەیت و دەتباتە دونیای ئەداکردن.
دیاردە و توانایەکی تر لەم هونەرمەندەدا ئەوەیە، کە توانایەکی باشی هەیە لە بواری ئاوازداناندا، کە ئێمەی موزیسیان یا کەسانی شارەزا و پسپۆڕ دەزانن ئاوازدانان بەهرەیە، کەمن ئەوانەی لەم بوارەدا سەرکەوتوون، یا ئاوازی جوان دابنێن.
کەریم کابان زۆرینەی گۆرانییەکانی لە ئاوازی خۆین، تەنانەت ئاوازی بۆ گۆرانیبێژانی تریش داناوە، نموونەی گۆرانییە مەشهورەکەی (قادر کابان) (جادە چۆڵ و سێبەر بوو) لە هۆنراوەی گۆرانی شاعیر. سەرەڕای نەزانینی لە ئوسولی ئاوازدان و تەئلیفدا، کە حەرفی هیچ مەکتەبێکی هونەری موزیکی نەخوێندووە، بەڵام بەهرە و سەلیقەی خۆی ئەم توانا جوانەی پێبەخشراوە، جوانترین نموونەم ئاوازی گۆرانیی (شەو، یاران وەسێتم، گیانە لە پرخەی خەوی خاومدا)، کە چەند بە جوانی و ئیحساس و سۆزەوە مامەڵەی لەگەڵ هۆنراوەکەدا کردووە، ڕستەی موزیکیی بەهێز و بەتوانای بۆ داناوە، هەڵبژاردەی گونجاو و تەواوی پڕ بە مانای شیعرەکە لە مەقامەکاندا بۆ کردووە. یا جاری وا هەبووە نەک تەنها یەک مەقام، بەڵکو مەقامی تری لە یەک ئاوازدا بەرجەستە کردووە بێ ئەوەی لە سیستمی زانستیی تەئلیف و ئاوازدانان دەرچووبێت، دیارە ئەم توانا و بەهرەیە لە ئاوازداناندا کەم ڕوو دەدات... چەندین سکێڵی مەقامە کوردی و ڕۆژهەڵاتییەکانی بۆ ئاوازدانان بەکار هێناوە، وەک سکێڵی مەقامی (کورد، عەجەم، بەیات، سێگا، حیجاز، حیجازکار، نهاوند... هتد) کەریم کابان نەک هەر لە ئەدای بەستەکاندا سەرکەوتوو بووە، بەڵکو لە ئەدای مەقامەکانیشدا سەرکەتوو بووە و توانای ئەدا و وتنی مەقامە ڕۆژهەڵاتییەکان بەگشتی و مەقامە کوردییەکانی بەتایبەتی زۆر باش بووە.
کەریم کابانی هونەرمەند ئەندامێکی کارای تیپی مۆسیقای سلێمانییە... هەمیشە خۆی بە قوتابی و خوێندکاری قوتابخانە هونەرییە گەورەکەی تیپ زانیووە و شانازیی پێوە کردووە. هەمیشە پابەندی ڕێنمایی و یاسا و بۆچوونەکانی موزیسیانەکانی تیپ بووە، پەیوەندیی دۆستانە و خۆشەویستانەی لەگەڵ ئەندامانی تیپەکە بەستووە، خۆشەویست بووە لای ئەندامان و ئەوانیش تەواو ڕێزیان لێگرتووە، چونکە لەناو تیپدا کەسایەتییەکی ڕۆحسوک و هێمن قسەخۆش و بەڕێز بووە.
بە بۆچوونی من، گۆرانییەکانی کەریم کابان بە دوو قۆناغدا تێپەڕیووە و پۆلێن دەکرێن:
قۆناغی یەکەم/ ئەو گۆرانییانە بوون، کە کاتێک کەریم کابان لە خوارووی عێراق ژیاوە و لە ڕادیۆی کوردیی بەغداد تۆماری کردوون، وەک گۆرانی (بەری بەیانە، بڵێن بە یار، لە مابەینی گوڵوگوڵزار... هتد) کە تیپی مۆسیقای ئێستگەی ڕادیۆی بەغداد، بەشی کوردی تۆماریان کردووە، کە ئەندامانی ئەو تیپە زۆرینەیان لە ڕەگەزی عەرەب بوون و هەندێکیان نابینا بوون، شارەزایی زانستەکانی موزیکیان بەو جۆرە نەبووە، چ لە ڕووی پێشەکیی موزیکی و دابەشکردن و زانستی هارمۆنی... زۆر سادە و ساکارانە ژەنینیان بۆ کردووە، کە تاموچێژی ڕەسەنی کوردیی تێدا نییە. دەنگی کەریم کابان لە لایەک و مۆسیقاش لە لایەکی تر... دوور لە یەک تەنها دەنگی زوڵاڵ و خۆش و ڕەسەنی کەریم کابان ئەدای جوانی بە گۆرانییەکان داوە، بەڵام لە ڕووی هونەری موزیکەوە لاوازە، لەم قۆناغەیدا کەریم کابان زۆر شوهرەت و ناوبانگی نەبووە، تەنها لە کوردستانی باشوور یا تەنها شاری سلێمانی ناوی هەبووە.
قۆناغی دووەم/ لەو کاتەوە دەست پێدەکات، کە لە شۆڕشی ئەیلول ١٩٧٤دا پەیوەندیی بە تیپی مۆسیقای شۆڕشەوە کرد، کە هونەرمەندانی تیپی

مۆسیقای سلێمانی و چەند هونەرمەندێکی شاری هەولێر و دهۆک ئەو تیپەیان پێک هێنابوو... کەریم کابان بە دوو گۆرانی، کە ئاوازەکەی خۆی دایناببوون، بەشداریی کرد. گۆرانییەکانیش گۆرانی (شەو، یاران وەسیەتم) بوون. زۆرم لا پەسەند و جوان بوو برادەرانی تیپ داوایان لە من کرد کە ئامادەی بکەم بۆ تۆمارکردن. ئەوە بوو ئامادەم کرد و پێشەکیی موزیکیم بۆ دانا، بەو توانا و ئیمکانیاتەی لە بەردەستماندا بوو لە ڕووی نەبوونی ئامێری تۆمارکردنی باش یا ستودیۆی هونەری. بە شێوەیەکی سادە، بەڵام ژەنینی بەتوانا تۆمارمان کرد و لە ئێستگەی دەنگی کوردستان بڵاو کرایەوە، کە تەنها کەناڵی ڕاگەیاندن بوو. هەر زوو ناوبانگی ئەم دوو گۆرانییە بڵاو بووەوە و جێگەی خۆی لە دڵی بیسەرانیدا کردەوە و شوهرەتی هەموو لایەکی گرتەوە. دوای تەواوبوونی شۆڕشی کورد و هەرەسهێنانی، باڵی خەم و پەژارە هەموو خەڵکی کوردستانی گرتەوە، نائومێدی باڵی کێشابوو، خەڵک دڵشکاو و مەئیوس بوون. ئەتوانم بڵێم ئەم دوو گۆرانییە تا ڕادەیەکی باش تەسکینی دڵ و ڕۆحەکان بوو، هیوا و گەشبینیی دایەوە بە جەماوەری کورد. پێش گەڕانەوەمان بۆ ناو شاری سلێمانی، ناوبانگی ئەم دوو گۆرانییە پێش ئێمە کەوتبوو و بە زاری خەڵکەوە بوو. پێش هاتنەوەی کەریم کابان، دوو گۆرانییەکەی هاتبوونەوە و خەڵک تامەزرۆی

کابان

بوون. بۆیە تیپی مۆسیقای سلێمانی بڕیاری دا بە تۆمارکردنەوەیان لە ناو ستودیۆی تیپ بە هەمان پێشەکیی موزیکی و ئامادەکردن، بەڵام ئەم جارە دابەشکردنی جوانی ئامێرەکانی بۆ کرا، کە هونەرمەند ئەنوەر قەرەداغی بۆی کرد و ژەنیارانی بەتوانای تیپەکە بە (Solo) جوانەکانیان، ئەوەندەی تر ڕازاندیانەوە و جوانیان کرد، سەرکەوتنی زۆری بە دەست هێنا و کەریم کابان و دەنگی چوونە قۆناغێکی ترەوە، قۆناغی ناوبانگ و شوهرەت و گشتگیری لە هەموو کوردستان، ئەتوانم بڵێم وەرچەرخانێکی هونەریی گەورە بوو لە ژیانی هونەریی کەریم کاباندا، جوانترین و باشترین و بەهێزترین گۆرانییەکانی کەریم کابان لەم قۆناغەدا بووە لەگەڵ تیپی مۆسیقای سلێمانیدا، کە چەندین گۆرانیی سەرکەوتوو چ لە ڕووی ئاواز چ لە ڕووی دابەشکردنی موزیک و یا ژەنین و یا تۆمارکردنی دەنگی و ڕەنگی و بەکلیپکردنیان زیاتر و زیاتر هونەری دەنگی کەریم کابانیان ناساند بە عاشقانی دەنگی لە سەرتاسەری کوردستانی گەورە و ئەو کوردانەی لە هەندەران دەژین. باشترین نموونەمان بۆ ئەم وەرچەرخانە هونەرییانەی کەریم کابان ئەو کۆنسێرتانە بوون، کە لەگەڵ تیپی مۆسیقای سلێمانی ئەنجامی دان لە شارەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات، بەتایبەتی لە شاری سنە. تەنها بە دەرکەوتنی کەریم کابان لەسەر شانۆ یا لە شەقام و پارکەکانی ئەو شارە ئەوەندە عاشقانی دەنگی لێی کۆ دەبوونەوە و دەوریان دەدا، بە ئەندازەیەک لە خۆپیشاندانی جەماوەری دەچوو، کە بە تەواوی مەترسیی لای پیاوانی ڕژێم دروست کردبوو. ئا بەم جۆرە دەنگی ڕەسەن جێگەی لە دڵ و دەروونەدا هەیە. چۆن پەپوولە دەوری گوڵ دەدات، ئاواش هەواداران و عاشقانی دەوری دەدەن و تامەزرۆن لە نزیکەوە بیبینن، وێنەی لەگەڵ بگرن، گوڵی وەفاداریی بدەنێ.

ئەم نووسینەی من کورتەیەکە لە باسکردن و ناساندنی هونەریی دەنگی کەریم کابان، کە هەرگیز قەڵەم بە نووسینی ناتوانێ مافی تەواوی بداتێ و لە هەموو بوارەکانی ئەم هونەرمەندە بڵێ و بنووسێ. هیوادارم کەم تا زۆر توانیبێتم تیشکێک بخەمە سەر خەرمانی هونەریی خۆشیی دەنگی کەریم کابان.

سلێمانی ٢٠١٢/٦/٢

# کەریم کابان

## مۆرک و ناسنامەی گۆرانیی کوردی نوێ

**عادل محەمەد کەریم**

کەریم کابان، ئەو گۆرانیبێژە هەستناسکەی گەلەکەمانە، کە لە قوتابخانە پڕ میهرەکەی دایکی نیشتیمان و لە گەنجینەی لەبنەهاتووی کولتووری گۆرانی و مۆسیقای نەتەوەکەیەوە سەرچاوەی گرتووە، کوردوستان و شاری سلێمانی جێژوانگەی هەواری عەشقی کەریم کابانە بۆ هونەری گۆرانی و ناخی عاشقێک چەندە ڕاستگۆ و بەکەفوکوڵە بەرامبەر دولبەرە پەری نازدارەکەی. کەریم کابان هاوشێوەی ئەو عاشقە بێسەروشوێن و وێڵەیە بەرامبەر بە ئاوازە ئەفسوناویەکانی و چڕینی

گۆرانییەکانی، ئەوەتا کوچە و کۆڵانەکانی سلێمانی و کۆبوونەوەی کوڕوکاڵی نێو گەڕەکەکانی ئەم شارە لانکەی لەدایکبوون و چڕینی گۆرانی بوون بۆی، ئەوەتا خۆی ئاماژە بەوە دەدات کاتێ لە دیمانەیەکیدا دەڵێت (لە بیرمە کە منداڵ بووم، کوڕوکاڵی گەڕەک کۆ ئەبووینەوە، هەموو ڕابواردنی شەوانمان ئەوە بوو کە بە گۆرانیوتن بە کۆڵانەکانی گەڕەکی خۆماندا لە سلێمانی ئەگەڕاین). ئەمە بە یەکەمین دەستپێکی کاک کەریم دادەنرێت بۆ هاتنەناو دنیای هونەر، دیارە کە گۆرانیی وتوە، دەنگی ئەم دیار بووە، بۆیە ئەم بووەتە سەرقافڵەی هاوڕێیانی، هەروەها ئاماژە بەوەش دەکات کە کاتێک قوتابی بووە لە قوتابخانە، لەو قوتابییانە بووە، کە هەمیشە لە گۆڕەپانی قوتابخانە هێنراوەتە دەرەوە و سروودی (براینە لە خەو هەڵسن بەیانە) و سرووده نیشتیمانییەکانی تری چڕیووە، هەروەها لە ساڵانی 1942 بۆ 1943 زۆربەی جار لە ئێستگە ناوچەییەکەی سلێمانی گۆرانیی وتوە. ئەو کاتە ئەو ئێستگەیە کە دامەزراوە، لە بەردەرکی سەرای شار دانیشتوانی شاری سلێمانی لەمبەر و ئەوبەری جادەکە دانیشتون تا گوێبیستی گۆرانی و بەرنامەکانی ئەو ئێستگە ناوخۆییە ببن، وا دیارە ئەمە سەردەمی پێش هاتنی ڕادیۆیە بۆ شار (ئەم ئێستگەیە بریتی بووە لە جیهازێکی ئیمپریفایەر و چەند موکەبەرەیەکی دەنگ، کە لە چەند جێگەیەکی گونجاوی بەردەرکی سەرادا دانراون تا خەڵکەکە بە ئاسانی گوێبیستی بەرنامەکان ببن. مامۆستا کەریم بەم شێوە هاتووەتە ناو دنیا بەرینەکەی هونەری ساز و ئاواز. لە ساڵی 1946-1945دا چووەتە ئێستگەی بەغدا و لەوێ ڕۆژانی هەینی تەرخان کراوە بۆ گۆرانیبێژانی کورد. کاک کەریم وەک دەڵێت: لەوێش بە زیندوویی، واتە ڕاستەوخۆ چەندین جار بەشداریی کردووە و گۆرانیی چڕیووە. ئەمانە هەمووی فاکتەری سەرهەڵدانی هونەری کاک کەریم بوون، کە دوای لە کۆتایی شەستەکان و سەرەتای حەفتاکان تەواو ئاسۆی بیری

ئاوازدانانی مامۆستا پەرەی سەند و ئاوازەکانی وەرچەرخانێکی مێژوویی بوون بە بەراورد بەو ئاوازە میلی و فۆلکلۆرییانەی کە باو و بڵاو بوون. دیارە هۆکاری تریش هەبوون، لەوانە دامەزراندنی تیپی مۆسیقای مەولەوی، دواتریش لە ساڵی 1967وە تیپی مۆسیقای سلێمانی، کە هەریەکە لەم دوو تیپە لەسەر دەستی چەند هونەرمەندێکی ژەنیاری لاوی شاری سلێمانی دروست ببوون، کە بەوپەڕی توانایانەوە دەرویشئاسا کاریان کردووە و بە هەوڵ و تەقەلای ئەمان ڕەوتی هونەری گۆرانی و مۆسیقای کوردی بەرەو پێشکەوتن هەنگاوی نا و چەقی نەبەست لەو قابەی کە پێشتر تیایدا بوو. کاک کەریم دەرچووی هیچ دامەزراوە و ناوەندێکی هونەری نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خاوەنی دەنگێکی بێخەوش و بێگەردی مۆسیقیی پاکە و ئاواز و بەرهەمە ناوازەکانی بە پەنجەی دەست ئەژمار دەکرێن، بەڵام کورد وتەنی (کەم و پوختە، نەک زۆر و بۆر). هەر ئاواز و بەرهەمێکی کێوێکە لە خەرمانی پڕ بەرەکەتی هونەری گۆرانی و مۆسیقای کوردیی ئەمڕۆمان، کاک کەریم لە کاتی چڕینی گۆرانیدا پەپوولەئاسا دەفرێت و لە دونیای واقیع دەردەچێت و ئەدا لە شەقەی باڵی فرین بۆ دنیا ئەفسوناوییەکەی خەیاڵی شاعیر، بەوپەڕی ڕاستگۆییەوە بە جوڵە جوانەکانی جەستەی هەر لە جووڵەی (دەموچاو برۆ و پەنجە و دەست و لەشولاری...) هەمووی تێکەڵ دەبێت تا بتوانێ بە جوانترین شێوە سەرنجی گوێگر ڕابکێشێت بەرەو دونیای جوانی هونەری گۆرانی. لە سیما ناوازەکانی کارە هونەرییەکانی هونەرمەند: کەریم کابان خاوەنی ستایل و شێوازی خۆیەتی، واتە گۆرانی و ئاوازەکانی لە گۆرانی و ئاوازی کەسی تر ناچێت، لایەنێکی تری هۆکاری شاراوەی سەرکەوتنی هونەرمەندی گۆرانیبێژ هەڵبژاردنی هۆنراوەی گۆرانییەکانیەتی، کە کاک کەریم لەم وردەکارییە بێبەش نییە و زۆر شارەزایانە هۆنراوەی بۆ گۆرانییەکانی هەڵبژاردووە، لە ڕووی

تەکنیکی هونەرییەوە ماوەی میانەی ئاوازەکانی لە نیوان تۆنی گڕی خوارەوەی لەگەڵ تۆنی تیژی سەرەوە لە میانەی پێنجی تێدەپەڕێت و زۆر جار دەگاتە زیاتر لە ئۆکتاف، واتە هەشت دەنگ زیاتر. جگە لەمە، لە ئاوازەکانیدا گۆڕانکاری پەیژە و مەقامەکان بەدی دەکەین، جگە لەمانە لایەنی دینامیکیەت (پیانۆ و فۆرتی و کریشاندۆ و دیمیناندو و چەندین دینامکیەتی تر و تە کنیکی تر لە دەنگیدا بە ڕوونی دەبینرێتەوە... ئەمەیە کە دەڵێین هونەرمەند دەرچووی هیچ فێرگەیەکی هونەری نییە، بەڵام بە بەرجەستەکردنی ئەو تەکنیکە هونەرییانەی کە ئاماژەمان پێدا، دەتوانین بڵێین کە لە زۆربەی زۆری ئەوانەی کە خاوەنی بڕوانامەی زانستین و دەرچووی فێرگە هونەرییەکانن، باڵاترە.

وەنەبێ کەریم کابان شارەزای چڕینی مەقام نەبێت، بەڵام بەرهەمی تۆمارکراوی چڕینی مەقامی نییە، هۆکاری ئەمەش هەروەک لە خۆیم بیست، وتی من زۆر گوێبیستی مەقامبێژان بووم لە کورد و لە عەرەب و فارس، بەڵام نامەوێ شتێک بڵێم لە مەقامبێژە ناودارەکان کەمتر بێت. ناکرێ لە بەردەم ئەم وەڵامەدا هەڵوێستەیەک نەکەین؟؟ ئەم وەڵامە بە لای من ئەوە دەبەخشێت، واتە مامۆستا هاوشێوەی بەستەی گۆرانییەکان ئاگای لە مەقامەکانیش بوو، بەڵام لە خەمخۆری و پەرۆشی بۆ چۆنێتیی چڕینی مەقام، مەقامی نەدەچڕی. بۆ یەکەم جار لە چەشنواری مۆسیقا لە شاری سنە گوێبیستی هونەرمەند بووم کە مەقامێکی زۆر جوانی چڕی، کە جێگەی سەرنجی ئامادەبووان و تەنانەت زۆرێک لە ژەنیارانیش بوو بە خۆشمەوە. بۆیە دەڵێم ئەگەر مامۆستا خۆی لە قەرەی چڕینی مەقامیش بدایە، زۆر وەستایانە و لێهاتووانە میراتێکی هونەریی بەرزی بۆ تۆمار دەکردین.

ئەگەر لە ڕووی هونەرییەوە بڕوانینە ئاوازەکانی هونەرمەند کەریم کابان، ئەوا ئەو ڕاستییە بەدی دەکەین، کە ئاوازەکانی هەڵقوڵاوی خەیاڵدانی

خۆیەتی و دووره لە ئاوازی کەسانی دی و مامۆستا زۆر ڕاستگۆیانە گوزارشتی لە ناوەڕۆکی هۆنراوە و وشەکانی هۆنراوەکان کردووە و بێرتوشە، واتە کاریگەریی دەستکردی ئەملاولا نییە و هەست بە بوونی ڕۆح و زیندوویێتی دەکەیت، کە ئەمە سیما سیحراوییە جوانەکەی هونەرە. هەروەها ئەمەش بەدەر نییە لە لایەنە هونەرییە مۆزیکییەکە، واتە ئەم لەدایکبوون و بوونی ڕۆحە هونەرییە لە ئاوازەکان لە توێکاریی کارەکاندا لە ڕووی تیۆری مۆزیکەوە زۆر شتمان بۆ ڕوون دەکاتەوە و ئەوەمان پێدەڵێت، کە ئەم ئاوازانە لە ڕووی تیۆریشەوە سیمایان زۆر جیایە لەگەڵ ئاوازە فۆلکلۆری و میللییەکان و ئاوازی هونەرمەندانی تر. بۆیە بە پێویستم زانی لەم دەرفەتەدا سەرنج و لێکدانەوەیەکی خێرا بۆ یەکێک لە شاکارە جوان و ناوازەکانی هونەرمەند کەریم کابان بکەم، کە ئەویش گۆرانی (شەو)ە، کە یەکێکە لە بەرهەمەکانی تیپی مۆسیقای سلێمانی.

گۆرانیی: شەو

هۆنراوەی: شێخ نوری شێخ صالح و ئەحمەد هەردی

ئاوازی:کەریم کابان

ناوی گۆرانیبێژ: کەریم کابان

ئامادەکردنی مۆسیقا: خالید سەرکار

*–ڕەگەزە بەکارهاتووەکان:

ڕەگەزی بنەڕەتیی ئاوازی شەو بریتییە لە پەیژەی یان مەقامی (کرد) لەسەر تۆنی (ڕێ)، هەروەها ڕەگەزێکی سەرپێیش عەرەزی بەکار هاتووە، کە بریتییە لە پەیژەی یان ڕەگەزی یەکەم لە مەقامی عەجەم لەسەر تۆنی (فای یەکەم):

– پەیژەی بنەڕەتیی گۆرانی شەو (کرد)ە لەسەر تۆنی (ڕێی یەکەم تا ڕێی دوەم):

*– دەستنیشانکردنی (تۆنی سەرەتا و تۆنی کۆتا و بەرزترین تۆنی) ئاوازی ڕستەی میلۆدییەکانی گۆرانی شەو:

| ئاوازی ڕستەکان | تۆنی سەرەتا | تۆنی کۆتا | تۆنی بەرز |
|---|---|---|---|
| A | لا١ | فا١ | لا١ |
| B | صول١ | ري١ | صول١ |
| C | دو٢ | ری٢ | فا٢ |
| D | مي بيمول ٢ | فا١ | مى بيول٢ |
| E | فا١ | ري١ | فا١ |
| F | صول١ | ري١ | لا١ |

ئاوازی ڕستەکان تۆنی سەرەتا تۆنی کۆتا تۆنی بەرز

A لا1 فا1 لا1

B صول1 ري1 صول1

C دو2 ری2 فا2

D مي بيمول 2 فا1 مى بيول2

E فا1 ري 1 فا1

F صول1 ري1 لا1

ئەم خشتەیە ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، کە ئاوازی ئەم گۆرانییە سەرەتای دەستپێکردنەکەی لە تۆنی پێنجەمی پەیژە بنەڕەتیەکەوە دەست پێدەکات، کە لە بنەڕەتدا تۆنی بنکەی پەیژە و مەقامی بنەڕەتی (کوردە لەسەر تۆنی ڕێ). ئەم پێنج تۆن لە سەروو ڕێوە دەست پێدەکات، واتە میانەیەکی پێنجی تەواو لە سەروو تۆنی بنکەوە تۆنی کۆتای ئەم ڕستەیەش تا تۆنی فایە، واتە

ئەم ڕستەیە تەنها لە سێ تۆندا کار دەکات، لە ڕستەی دووەم بە تۆنی سۆڵ دەست پێدەکات تا تۆنی بنکە، کە ڕێیە، ڕستەی ئاوازەکە دادەبەزێت لە ڕستەی سێیەمی ئاوازەکە، واتە بەشی (C)، ئەمە بەشی بەرزی ئاوازەکەیە، کە لە تۆنی بنکەوە هەڵدەکشێ بۆ تۆنی (دۆی دووەم)، کە بە میانەیەکی حەوتی گەورە لەوێوە تا تۆنی فای دووەم ئاوازەکە فراوان دەبێت، کە ئەمە چینێکی دەنگیی بەرزە و لە ئاوازی کوردی باودا ئەم فراوانبوونانە دەگمەنن. لەم بەشەدا لەسەر تۆنی ڕێی دووەم دەگیرسێتەوە، لە بەشی (D)دا نیو تۆن سەردەکەوێت بۆ می بیمۆل، جارێکی تا تۆنی ترۆپکی ئاوازەکە سەردەکەوێت و هەر لەم بەشەدا دەگەڕێتەوە و ئاوازەکە دادەبەزێت تا تۆنی (فای یەکەم) و لە بەشی (F-E)ی کۆتاشدا ئاوازەکە بەرەو تۆنی بنکە دادەبەزێت. بەم شێوەیە ئەم ئاوازە لە ڕووی تیۆرییەوە ئەگەر بەراوردی بکەین بە ئاوازە کوردییە باوەکانی تر، لەماندا ئەم وردەکارییانە نابینین. چونکە ئاوازە فۆلکلۆرییەکان و ئاوازە میلییە باوەکانیش میانەی ڕستەی میلۆدیی ئاوازەکان لە سێ بۆ چوار تۆن تێناپەڕن.

میانەی گشتی ئەم گۆرانییە میانەیەکی دەییە لە ڕێ یەکەمەوە تا فای دووەم، بەم شێوەیە:

ئەمە بەشێکی کەمە لە سەرەتای شیکردنەوەی گۆرانیی (شەو). دیارە بۆ دیاریکردنی ئەدگارەکانی تری ئاوازی ئەم گۆرانییە و نیشاندانی سیماکانی تری پێویستیی زیاترمان بە هەندێ لایەنی تری شیکردنەوە دەبێت، لەوانە ڕێژەی دروستبوونی میانەکان و شیکردنەوەی ڕیتم و مەتریکا و شیکردنەوەی بڕگەی وشەی هۆنراوەی گۆرانییەکە و هەندێ هێڵکاریی تر و چۆنیەتیی مۆسیقای پێشەکی و مۆسیقای هاوشانی کاتی گۆرانی و زۆر شتی تر.

لە ڕێگەی ئەم شیکردنەوانە و جۆری تری شیکردنەوەکان دەگەین بەوەی کە بتوانین بە بەڵگەوە و بە شێوازێکی زانستییانەی ڕوون قسە لەسەر ئاوازە کوردییەکانمان بکەین.

دیارە ئەم ئاوازە یەکێکە لە ئاوازە دیار و ناسراوەکانی هونەرمەند، کە پێگەیەکی تایبەتی لە مۆسیقا و گۆرانیی کوردی نوێماندا هەیە و هەر کاتێک کە گوێبیستی دەبین، من دڵنیام لە کاتی خۆی و بە ئێستاش و لە ئایندەشدا کاک کەریم بەم ئاوازەی گوێگرانی ستایشی دەکەن و هەمیشە دەنگە پڕ میهر و ناسکەکەی زیندوو لە ناو دڵ و دەرونماندا دەمێنێتەوە و ویژدانمان قەرزارباری کاک کەریم دەکات، چونکە دەنگە ئەفسوناوییەکەی ڕاستەوخۆ موخاتەبەی ویژدانمان دەکات و دڵەکانمان پێی ئاو دەخواتەوە و مرۆڤ بەرەو ئاسودەی و شادمانی دەبات. ئەوەشمان بیر نەچێت کە کاری ئامادەکردنی مۆسیقاکەش هۆکار و فەکتەرێکی بەهێزی تری سەرکەوتنی

(گۆرانی شەوە)، کە بێگومان مامۆستای هونەرمەند (خالید سەرکار) بەوپەڕی ڕاستگۆییەوە مامەڵەی لەگەڵ ڕستەی ئاوازی میلۆدییەکەدا کردووە و تەواو لە ناخەوە لە ئاوازەکە تێگەیشتووە، بۆیە توانیوێتی مۆسیقایەک ئامادە بکات، کە لە ئاستی ئاوازەکە کەمتر نەبێت، هەروەها برایانی ژەنیاریش لە تیپی مۆسیقای سلێمانی کە بەوپەڕی هەست و ویژدانەوە کارەکەیان ڕاپەراندووە و هەروەها کاری تۆمارکردنیش کە ناکرێ باس نەکرێت، کە مامۆستا ئەنوەر لەو کاتەدا نەفی بووە لە شاری سەماوە، کە گەڕاوەتەوە ئینجا ئەم بەرهەمە تۆمار کراوە، ئەمانە هەمووی هۆکارن بۆ سەرکەوتنی بەرهەمێکی هونەریی گۆرانی و مۆسیقا. بە پێویستم زانی کە ناوی ژەنیارانی بەشداربوو لە تۆمارکردنی ئەم بەرهەمە قەشەنگە بخەمە ڕوو، بۆ ئەم مەبەستە پەیوەندیم بە مامۆستا خالید سەرکارەوە کرد، وتی ئەم بەرهەمە لە مانگی پێنجی ساڵی 1974دا تۆمار کراوە. ئەوەی لە بیرم مابێت، لە بەشداربووان ئەم بەڕێزانەن: (ئامێری کەمانەکان: ئەنوەر قەرەداغی، خالید سەرکار، فەرەنسیس داود، سەلاح ڕەئوف- دلێر ئیبراهیم، فەرەیدوون دارتاش، فوئاد قەرەداغی)، (ئامێری چەلۆ: عوسمان محەمەد ئەمین)، (ئامێری عود: حسێن علی)، (ئامێری ئۆکۆردیۆن: ئەلبێرت عیسا- فەرید عیسا)، (ڕیتم: جەمال کابان، نوری قەرەداغی). مامۆستا خالید ئاماژەی بەوەش دا کە ڕەنگە هەندێ ژەنیاری تریشیان لەگەڵ بووبێت، بەڵام ئەم تەنها ئەوەندەی لە خەیاڵە و وتی داوای لێبوردن لەوانە دەکەم کە ڕەنگە بیرم چووبن.

ماوەتەوە بڵێین جێگەی شانازیمانە بۆ ئێمەی کورد خاوەنی کەڵە هونەرمەندی وەک کەریم کابانین، هەروەها بۆ ئێمەی هونەرمەندانی بواری مۆزیک کە ئاستی ئاوازە هونەرییەکانی مامۆستا و دەنگە پڕ میهرەکەیەتی وامان لێدەکات بەبێ سێودوو ستایشی بکەین و لەسەری بدوێین.

**سەرچاوە:**

**١- کەریم کابان: چەند سەربردەیەک. گۆڤاری بەیان. ژمارە 4. ساڵی 1979. لاپەڕە 61.**

**٢- دیداری تایبەتی نووسەر لەگەڵ خالید سەرکار.**

# سەردەمی کەریم کابان وانەیەک بۆ هەمووان

ئامانج غازی

گۆرکی لە دوای تەمەنی 40 ساڵیەوە ڕۆمانی (دایک)، شاکارە ئەدەبییەکەی بە مەرامی ئەوەوە نووسی، کە بە هەموومان بڵێ مرۆڤ ئا لەو سەردەمەدا نابێ بۆ خۆی بژی، بەڵکو هەمیشە بەو هیوایە ژیانی بڕ بکا و بەردەوام بێ، کە بەردەوامی سروشت لانکەزای ئیلهامەکانیەتی!
مرۆڤی مەزن کاتێ لە سەردەمە جەنجاڵەکانیشدا بە هێمنی بیر دەکاتەوە، ئا لەو ساتانەدا (کابان) ئاسا دەبینرێ و پلەوپایەی (کابان) ی هونەرمەندی پێ ڕەوا دەبینرێ.
کۆمەڵێ میلۆدی و ئاواز کە شادەماری پێکهاتەی جەستەی گۆرانیی کوردین و لە پەنجەکانی دەستمان تێپەڕ ناکەن، وەکو (تسۆنامی)یەکی بوونیاتنەر هەموو ئەو بابەتی (کرچوکاڵانەی) ڕاماڵی، کە ببوونە بەربەستێک لە بەردەم کانیاوی تازەگەری! ئا ئەمەیە هونەر کە (شۆنبێرگ)ئاسا منیش لەگەڵیدا دەڵێم هونەر نابێ بۆ هەموو کۆمەڵگە بێ، گەر وا دەرچوو، هەموو کۆمەڵگە لەگەڵیدا کەوتە هەڵەکەسەما، ئەوا بابەتی ئەفراندنئامێز تروسکایی هونەری نابینێ! کەواتە (کابان) ی هونەرمەند کاتێک ئاوازێک بە ناخیدا گوزەری کردووە و بە بەردەوامییش لە گوزەرکردندایە و خەریکە بگاتە ترۆپکی تەقینەوە، ئەو زاتە مەزنە هەست دەکا کانیاوی ڕۆحی پڕ میهرەبانی خۆی هەمیشە لە پەلەقاژێدایە لەگەڵ خودی خۆی!
لێرەدا پرسیار بە پێوە دەوەستێ و دەپرسێ: ئایا دەکرێ هونەرمەند ئاوازی ژیانی خۆی بکا بە قوربانیی

جەستەیەکی شەکەت و ماندوو؟ بەڵێ، (کابان) کردی. من لەو ساتەوەختەدا وا هەست دەکەم کە (کابان)ی هونەرمەند بەم شێوەیەی خوارەوە هزر و بیر و ئیلهامی نێو ناخی خۆی بەخشیووەتە هەست و سۆزی یەکەیەکەی هەموومان:
(لە ناو جەرگەی کۆنارای ژیاری خۆیدا هەمیشە ئاوێنەئاسا خۆزگەکانی دەوروبەری خۆی لە واقیعی تاڵدا کردووەتە ئاسۆیەک بۆ ئەوەی بتوانێت لە تونێلی ئەم ژیانە تاریکەدا تروسکاییەک لە نوری (ڕۆح)ی هونەریی خۆی ببەخشێتە شەوی ئەنگوستەچاوی ئەمڕۆمان).
من دەزانم ئەو شتانەی (کەریم کابان)ی هونەرمەندیان ئازار داوە و بە بەردەوامیش تا ئەمڕۆ وەکو (زام و خوێ) ئازاری ژیانی دەدەن، هەموو ڕۆژێ بە بەردەم بینا و دیدە کزەکانماندا گوزەریان کردووە و گوزەریش دەکەن، وەلێ ئەفسووس، نەمانتوانی لە عیبرەتی ئاوازەکانی دوێنێی ئەو، ئێستایەکی ئاییندەئامێزی بۆ برەخسێنین!
بۆیە کاتی بەراوردکارییەکی هونەری لە نێوان میلۆدییەکانی کەریم کابان و ئاوازی هونەرمەندانی تری کورد لە تاراوگە و نێو کوردستانی لەتلەتکراودا دەکەین، هەست بەو حاڵەتە نەخوازراوە دەکەین، کە هونەرمەندان بەگشتی ئیلهامی ئاوازەکانیان لە هاوچەرخێتیی بیرکردنەوەیەکی بەتاڵ لە مەعریفیەتی شینوشایی، ژان و خەندە چنیووە، وەلێ کاتێ گوێچکەی هەستیار گوێبیستی میلۆدییەکی (کابان)ی هونەرمەند دەبێ، دڵ لە ترسی خوێنی فشارهێنەر لە نێو پەراسووەکانی جەستەی لاوازی هەر هەموومان بە شەرمەوە ترپەکانی خۆی دەبەخشێتە هەناسە سوارەکانمان.
بۆیە لێرەدا لەدایکبوونی مەودایەک لە پانتایی تێگەیشتن و یەکتر خوێندنەوە و بەیەکەوەگرێدانی (دەقی زیندوو-دەنگی زوڵاڵ-میلۆدیی لێوانلێو لە ئەزموون) ڕادەگەیەنرێ و بۆ هەمیشە لە نێو پەردەگرافی ژیاندا مەحاڵە چیتر هەردوو چەمکی (هونەر و هونەرمەند) لە یەکتر بترازێن و لە والایی یەکتر جیا بکرێنەوە.
لە دوماهی دەربرینی نەستیی هەستەکانمدا هەست دەکەم سەردەمی (کەریم کابان) خەریکە لە نێو دەست و پەنجە زبراوییەکانیدا بە ئارامی نەشونما دەکا، بۆیە حەق وایە لە کەڤاڵ و پانۆرامای ئەمڕۆی کوردستان مێژووی لەدایکبوونی یەکەیەکەی ئاوازەکانی ئەم زاتە داهێنەرە بە نۆتەی ئەبەدیی عەرشی سەروەرییە هونەرییەکانی ئەم هونەرمەندە بێنازەدا بنەخشێنێ و ڕۆژانی سەخت و دژوار و نەهامەتی هونەرمەندیش هەر لە زێدی لە دایکبوونیەوە تا دەگاتە پەڕینەوە بۆ ئەودیوی سنووری بیرکردنەوەی هەر هەموومان، بکاتە وانەیەک، کە بە ڕاستی وانەی پڕ عیبرەت و پەندی هونەری بڵێ بۆ هەمووومان، بۆ ئەوەی ئێمە چیتر نەکەوینە نێو داوی خەیاڵی واقیعێکی وەهمئامێز، کە من دڵنیام ژەنیاران پێش ئاوازدانەران و گۆرانیبێژانیش پێش شاعیران دەزانن کە کولتووری زیندوو بە پاڵپشتیی کەلەپوورێکی زیندووتر دەژێتە نێو مێژوویەکی هەمیشە زیندوو، کە بێگومان ئەو مێژووە (کەریم کابان)ی تێدا پەروەردە و دواتریش یاخی بووە.

**ڕواندوز**

# نەجات ئەمین لەبارەی تایبەتمەندییەکانی هونەری (کەریم کابان)ەوە

**ئا: داستان بەرزان**

کەریم کابان یەکێکە لەو هونەرمەندانەی بواری گۆرانیی کوردی، کە لە ڕووی چەندێتییەوە بەرهەمێکی کەمیان هەیە، بەڵام لە ڕووی کاریگەرییەوە پێگەیەکی تایبەت و ڕووبەرێکی فراوانیان لە گوێگر هەیە، ئەمەش پەیوەستە بە هێزی داهێنان لە گۆرانییەکانی ئەودا. هەر وەک چۆن هونەرمەند (شەماڵ سائیب و قادر کابان و فەتانەی وەلیدی) و چەند دانەیەکی تر لە هونەرمەندانی بواری گۆرانی، بەو جۆرە توانیوویانە بە هۆی چەند گۆرانییەکی کەمەوە ئەزموونێکی ناوازە لە گۆرانیی کوردیدا دروست بکەن، بەوەی کاتێک گوێمان لە دەنگێک دەبێت، زۆر بە ئاسانی دەتوانین هەست بەوە بکەین، کە ئەو دەنگە لە دەنگی (شەماڵ سائیب) دەچێت، یاخود لە دەنگی (قارد کابان)ەوە نزیکە، یان لە (فەتانەی وەلیدی)یەوە،

بە هەمان شێوە زۆر بە ئاسانی دەتوانین دەنگی (کەریم کابان) لە ناو دەیان و سەدان دەنگی دیکەدا بناسینەوە چ وەک خۆی چ وەک کەسانێک کە هەوڵی لاسایکردنەوەی بدەن، بێگومان دروستکردنی ئەم ناسنامەیەش لە گۆرانیدا ئاسان نییە و پێویستی بە بەهرەیەکی باش و سەلیقەیەکی جوان هەیە، کە بە بڕوای زۆرێک لە موزیکناسانی کورد، هونەرمەند (کەریم کابان) خاوەنی ئەو سەلیقە و بەهرەیەیە. بۆ زیاتر سەلماندنی ئەم بۆچوونانە و بەدیارخستنی هەندێک لایەنی دیکەی هونەری (کەریم کابان)، پێمان باش بوو هونەرمەندی موزیسیان (نەجات ئەمین) بەتایبەت بۆ (ڕۆڤار) بدوێنین.

**ڕۆڤار**: هونەری (کەریم کابان) تاکو چەند هونەرێکی شارییە؟ واتە جیاوازە لە هونەری ئەو هونەرمەندانەی کە بارگاوین بە هونەری گوند و کاریگەریی دەنگ و ئاوازی لادێ و گوندیان بەسەرەوەیە؟

**نەجات ئەمین**: کەریم کابان دەنگێکی خۆشی ڕەسەنی پێوەیە، (ڕەسەن) مەبەستم لە ڕەسەنایەتیی کوردی نییە، بەڵکو مەبەستم لە شتێکە دروست کرابێت و پتەو بێت و جێگیر بووبێت. بۆیە گۆرانییەکانی ئەم هونەرمەندە هەموویان لە ئاستێکی باشدا وتراون و ئاوازەکانیشی زۆربەی زۆری ئاوازی خۆین و وەکو کەسێکی لێهاتووش لە بوارەکەدا دایناون و لەسەر ئاستی دەنگی خۆی دایڕشتوون، هەریەک لە ئاوازەکانیش پێناسەیەکیان گرتووەتە خۆیان و لە دروستکردنیان زۆر کەشێکی سلێمانییانەیان پێوە دیارە. گرنگترین شت لە گۆرانیی (کەریم کابان)دا کە ئەمە بۆ هەموو هونەرمەندێک پێویستە، ئەوەیە کە لە هەر شوێنێک گوێت لە گۆرانییەکی بێت، یەکسەر بەبێ هیچ دوودڵییەک دەیناسیتەوە، ئەمە لە هەموو گۆرانبێژێکدا ڕووی نەداوە، لەوانەیە هەندێک جاری وا هەیە، بڵێیت: ئەوە دەنگی لەو دەچێت، بەڵام لای خۆی وانییە، لە ڕووی ئاواز و شێوازی وتن و ئەو ئەتمۆسفێرەی دروستی دەکات لە گۆرانییەکانیدا، هەموو ئەم تایبەتمەندییانەش وا دەکەن سوور بین لەسەر ئەوەی کە ئەوە گۆرانی (کەریم کابان)ە.

**ڕۆڤار**: ئەم وەڵامەی تۆ بە مانای ئەوە دێت کە گۆرانیی کەریم کابان تایبەتە بە خۆی و دەنگی خۆی، ئەمە لە کاتێکدایە کە لە ئێستا جۆرێک هونەرمەند پەیدا بوون گۆرانی هونەرمەندەکانی پێش خۆیان دەڵێنەوە، ئایا ئەمە بۆ گۆرانییەکانی (کەریم کابان) شیاوە؟

**نەجات ئەمین**: هەموو کەسێک سەربەستە لەوەی کە گۆرانیی کێ ئەڵێتەوە، بە مەرجێک گۆرانییە ڕەسەنەکە لەناو نەبات و تێکی نەدات، زۆر گۆرانیبێژ هەن گۆرانی هونەرمەندی تر ئەڵێنەوە، هەندێکیان جوانیان وتوونەتەوە، هەندێکیان ناتوانم بڵێم: ناشیرینیان وتوون، بەڵام لەبەر ئەوەی ئۆرژیناڵەکەی ئەوەندە جوان وتراوە، ناتوانیت گوێ لە تازەکەی بگریت، بەڵام جاری واش هەیە گوێ لە تازەکەی ئەگریت لە خۆشەویستی گۆرانییە کۆنەکەیە، ئەو گۆرانبێژانەش کە گۆرانیی کۆن ئەڵێنەوە، لە خۆشەویستی گۆرانییەکە و گۆرانبێژەکە ئەو گۆرانییانە دەڵێنەوە، بەڵام چەندیان سەرکەوتوون لە وتنەوەیان، ئەوەیان من ناتوانم بڕیاری لێبدەم.

**ڕۆڤار**: ئەو تایبەتمەندییانە چین کە گۆرانییەکانی (کەریم کابان) لە گۆرانییەکانی هونەمەندانی سەردەمەکەی خۆی جیا دەکاتەوە؟

**نەجات ئەمین**: یەکێک لەو تایبەتمەندییانەی کە لە گۆرانی (کەریم کابان)دا هەیە، ئەو جۆرە سەندیمێنتالییەیە، کە لە گۆرانییەکانیدایە، کە بە نەرمونیانی ناسراوە، واتە چەند دەنگی بەرز بکاتەوە، هەر دەچێتە قاڵبی نەرمونیانییەوە، بە پێچەوانەی (حەسەن زیرەک)وە، ئەو چەند لە خوارەوە بیڵێت، هەر ناچێتە ئاستی نەرمونیانییەوە، بەڵام (کەریم کابان) چەند بچێتە سەرەوە، ئەوەندە

نەرمونیانە. ئەوە باشترین تایبەتمەندییە کە (کەریم کابان)ی پێ جیا بکەیتەوە لە گۆرانیبێژەکانی تر، جگە لە جۆری ڕیزبەندیی ئەو تۆنانەی کە (کەریم کابان) بۆ گۆرانییەکانی خۆی دایاندەنێت، کە هەر لەسەر ڕێچکەی ئەو نەرمییە تۆنەکان بۆ خۆی ڕیز دەکات.

**ڕۆڤار:** لە گۆرانیی کوردیدا دەکرێت گۆرانییەکانی (کەریم کابان) وەک ئەزموون سەیر بکەین و وەک ئەزموون مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین، لە کاتێکدا گۆرانییەکانی ئەو هونەرمەندە لە ڕووی چەندێتییەوە لە پەنجەکانی چەند دەستێک تێپەڕ ناکەن؟

**نەجات ئەمین:** گۆرانیبێژ و موزیسیان بە ژمارەی بەرهەم هەڵناسەنگێنرێت، بەڵکو بەو چەند ماددەیەی کە هەیەتی و چۆنێتیی مامەڵەی لەگەڵ ماددەکانیدا دەستنیشان دەکرێت. پاشان چەند دانەی هەیە؟ چەندی باشە؟ ئەوە گرنگە، نەک ئەوەی بۆچی سەد بەرهەمی نییە؟ بۆچی دانەیەکی تر تەنیا بیست دانەی هەیە؟ کەریم کابان وەکو کوردەوارییی دەڵێت: بەرهەمەکانی کەم و پوختن، ئەوەش خاڵێکی جوانی هونەری (کەریم کابان)ە.

**ڕۆڤار:** (کەریم کابان) لە تەواوی بەرهەمەکانیدا کەمترین مەقامی وتووە، هۆکاری ئەوە بۆچی دەگەڕێنیتەوە؟

**نەجات ئەمین:** پێش هەموو شت ئەوە بە ڕاستی لای من گۆرانیبێژە، چونکە لای من گۆرانیبێژ لەگەڵ مەقابێژ لەگەڵ حەیرانبێژ لەگەڵ لاوکبێژ هەمووی جیاوازن، ڕاستە هەیە هەمووی ئەڵێت، بەڵام مەقام ئەگەر بە سەربەستی بوترێ و گۆرانییەکی بۆ زیاد نەکرێت، ئەو کاتە تامی خۆی دەزانین، بەڵام تۆ گۆرانییەک دەڵێیت لە سەرەتاوە یاخود لە کۆتاییەوە مەقامێکی بۆ زیاد دەکەیت، ئەمە شتێکی زۆر شیاو نییە، بەتایبەتی لە فۆلکلۆر و ڕەسەنی کوردیدا. ئەگەر ئەمانە جیا بکرێنەوە، شتێکی زۆر باشە، چونکە دوو فۆڕمی جیاوازن. ڕاستە دەکرێت هەردووکیان لەسەر یەک سکێڵ بن، بەڵام جوانتر ئەوەیە هەریەکە و بە جیا مامەڵەی لەگەڵ بکرێت و بە جیا تۆمار بکرێن، بۆیە من هەست دەکەم سەرکەوتنی (کەریم کابان) لە گۆرانیوتندایە نەک مەقاموتن، ئەوەش لایەنێکی باشە و بە مانای ئەوەش نییە نەتوانێت مەقام بڵێت.

**ڕۆڤار:** ئەوەی ئێوە باسی دەکەن، ئەمڕۆ پێچەوانەکەی لە گۆرانیی کوردیدا دەبینرێت، دەبینین هونەرمەند هەیە لە یەک کاتدا موزیکژەنە، گۆرانیبێژە، ئاوازدانەرە، زۆر کات شیعری گۆرانییەکەش دادەنێت، ئەمە جۆرێک لە قەرەباڵغی و بێسەروبەری دروست ناکات؟

**نەجات ئەمین:** دڵنیابە ئەو بێسەروبەرییە هەیە، زۆر زۆر بە ڕوونیش دیارە، هەرچی هەڵدەستێت و گۆرانیی کەسانی تر دەڵێتەوە، بێ ئەوەی ئاماژە بە خاوەنەکەی بکات، جگە لەوەی دونیایەک شتی بۆ زیاد دەکات و دەیشێوێنێت، بەڵام ئەمانە هەمووی تەمەنێکی زۆر کورتیان هەیە، لە ساڵی نەوەکانەوە وەربگرین، دەبینین لێشاوێکی زۆر بوونی هەبووە و هەیە، بەڵام کوا ئەوانە توانییان ببنە گۆرانیبێژ؟ هەندێکی دیاریکراوی لێ دەربچێت، خەڵکانی وەکو (حەسەن زیرەک و کەریم کابان و مەزهەری خالقی...) زۆر نین، تەنانەت هەندێک کەس خۆی وازدەهێنێت، دوای ئەوەی بۆی دەردەکەوێت ناتوانێت ببێتە هونەرمەند.

**ڕۆڤار:** ئایا مانەوە لە بواری گۆرانیدا پێویستی بە هێزێکی باشی داهێنان نییە بۆ ئەوەی بەردەوامی بە خۆی بدات؟ یاخود بوونی بوێری ئەوەی

بتوانی گۆرانی بڵێیت، بەسە بۆ ئەوەی ببیتە هونەرمەندی گۆرانیبێژ؟

**نەجات ئەمین**: بابەتی داهێنان تالێنتی پێویستە، جگە لە بارە خۆڕسکییەکە، لە هەر بوارێکدا بێت، ئەم تالێنتە پێویستە، چونکە کە تۆ تالێنتت نەبوو، ناتوانیت پێشکەوتن دروست بکەی، ڕەنگە بە ڕێکەوت گۆرانییەکی باش بڵێیت، ئەوە ڕێکەوتە یاخود لە هەڵەوەیە، ئەگەر نا، لە زیرەکییەوە نییە. بەڵام کە تالێنتت هەبوو، بە هونەرەکەتەوە دەردەکەوێت. سەیر دەکەی چەند دانەیەک گۆرانی دەڵێیت باشن، تۆ بیست گۆرانی بڵێیت، دانەیەکت کەمێک خراپ بێت، ئەوە ئاساییە، بەڵام لە بیست لە دانە تەنیا دانەیەکت باش بێت، ئەوە ئاسایی نییە، دڵنیابە هیچ تالێنتێکی تیا نییە، بۆیە تالێنت بۆ گۆرانیبێژی خۆرسک زۆر پێویستە، لەبەر ئەوە وشەی خۆرسکیش بۆ (کەریم کابان) بەکار دێنم، چونکە کەسێکی ئەکادیمی نییە، ئەگەر نا، بە جۆرێکی تر قسەم لەسەر دەکرد، بەڵام تالێنتی ئەم هونەرمەندە لە ئاستێکی باشدا بووە و بووەتە هۆی دروستکردنی چەندین گۆرانی و ئاوازی جوان و سەرکەوتوو.

**ڕۆڤار**: لە گۆرانییەکانی (کەریم کابان)دا بە ڕوونی هەست بە کەشی شاری سلێمانی دەکەین، ئایا ئەمە بە زیانی گۆرانییەکانی نەگەڕاوە؟ لەو ڕووەی خەڵکی ناوچە و شارەکانی دیکە چێژ لە گۆرانییەکانی وەرنەگرن؟

**نەجات ئەمین**: بە پێچەوانەوە، بەڵێ ڕاستە (کەریم کابان) بەو کەشە ناسراوە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە خەڵکی شوێنەکانی تر نەیانەوێت، برۆ بزانە لە ڕۆژهەڵات چی بۆ (کەریم کابان) دەکرێت؟ یاخود بادینییەکان چەند گۆرانییەکانی دەڵێنەوە؟ یان لە ڕۆژئاوا، ڕاستە زۆر تایبەتمەندیی سلێمانی پێوەیە، بەڵام سلێمانیش ناوچەیەکی بەرفراوانە، بۆیە من ئەوە بە هۆکارێک نازانم کە گوێگری کەم بکاتەوە،

بەڵکو بەپێچەوانەوە.

**ڕۆڤار:** یادەوەریی تۆ چییە لەگەڵ (کەریم کابان) دا چ وەک گۆرانییەکانی، چ وەک هونەرمەندێک کە لە هەمان بواری ئێوەدا کار دەکات؟

**نەجات ئەمین:** هیچ یادەوەرییەکم لەگەڵ خودی (کەریم کابان) نییە، چونکە وەکو تەمەن نێوانمان زۆرە، کاتێکیش گەیشتمە تەمەنی لاوی، لە شانزە ساڵییەوە بەرەو هەندەران ڕۆیشتم، بەڵام کە لەوێش بووم، کەشی (کەریم کابان) هەمیشە لە گوێمدا بووە، هەمیشە هەستم بە جوانی و پاکییەکەی کردووە، هەمیشەش لەگەڵمدا بووە. دەنگی (کەریم کابان) لە هەر کوێ بێت، ناتوانم لێی بێزار بم، ناتوانم گوێی لێنەگرم، لەوانەیە کاتێک کە کەسێکی تریش گۆرانییەکی بڵێتەوە کە گوێی لێدەگرم، لەبەر (کەریم کابان) بێت، گۆرانییەکانی (کەریم کابان) جوانن، ئەو نەرمونیانییە و ئەو سەنتیمێنتالییەی لەودا دەیبینم، کەم گۆرانیبێژ هەیە بگاتە ئەو جێگەیە. باسی مامۆستا (عەلی مەردان) ناکەم، چونکە ئەو قوتابخانەیەکی تایبەتە و نامەوێت بیانخەمە ڕیزێکەوە، لەبەر ئەوەی هەر یەکەیان تایبەتمەندیی خۆی هەیە، بەڵام (کەریم کابان)یش یەکێکە لەو گۆرانیبێژە سەرکەوتووانەی زۆر بە باشی کاری هونەریی خۆی ئەنجام داوە.

**ڕۆڤار:** هەرگیز ڕووی داوە لە یەکێک لە ڕۆژەکانی تاراوگە یاخود ئێرەدا هەستت کردبێت پێویستت بە گوێگرتنە لە (کەریم کابان)؟

**نەجات ئەمین:** ناتوانم بڵێم تەنیا (کەریم کابان)، بەڵام گوێگرتن لە گۆرانی بۆ من وەکو دەرمانە، جاری وا هەبووە لە بازاڕەوە تەکسیم گرتووە بۆماڵەوە تەنیا لەبەر ئەوەی گوێم لە گۆرانی بێت، جاریش هەبووە گەڕاوم بۆ کاسێتێکی (کەریم کابان) تاکو گوێی لێبگرم.

**ڕۆڤار:** لە ناو سەرجەمی گۆرانییەکانی (کەریم کابان)دا کامیان جیاوازتر لەوانی تر لای تۆ جێگەی بایەخە؟

**نەجات ئەمین:** گۆرانییەکانی (کەریم کابان) هەموویان جوانن و پێگەی خۆیانیان هەیە، بەڵام لای من گۆرانی (خەنەبەندان)ی لە هەموویان تایبەتترە، ئەمەش بە مانای ئەوە نییە ئەوانی ترم بۆ گرنگ نەبن.

**ڕۆڤار:** شتێک هەیە بتەوێت باسی بکەیت و ئێمە لێمان نەپرسیبێت؟

**نەجات ئەمین:** وابزانم زۆر شتمان باس کرد، دەستخۆشیتان لێدەکەم، کارێکی باش دەکەن بایەخ بە هونەرمەندێکی وەکو (کەریم کابان) دەدەن، چونکە بە ڕاستی شایەنی ڕێزلێنانە.

# ئیتنۆلۆژیای مۆسیقا لە نێوان هونەرمەند کەریم کابان و تیپی مۆسیقای شار

ئا: ئازاد مەعروف

هەموو توێژینەوەیەک بەدواداگەڕانە، توێژینەوەش ئەو شتە لە پێشتر ڕێنما دەکات، کە بەدوایدا دەگەڕێت. توێژینەوە گەڕانە بە زانینەوە بە دوای شتێکدا، کە هەیە و بوونی ئەویش وەکو ئەوەیە کە هەیە. بەدواداگەڕان بە زانینەوە شێوازی لیکۆڵینەوە وەردەگرێت کە کەسێک تیایدا دەیەوێت بزانێت پرسیارەکە سەبارەت بە چییە و خەسڵەتەکانیشی بدۆزێتەوە. هەموو توێژینەوەیەک وەکو توێژینەوە لەو بابەتەی کە هەیە، لە شتێکە پرسیاری لەبارەوە دەکرێت.

هەموو توێژینەوەیەک پرسیارکردنە سەبارەت بە شتێک، لە سەروو ئەمەوە توێژینەوە خاوەنی بابەتی

لێکۆڵینەوەیە لەو پرسیارکردنانەی بیردۆزی بێت، ئەوەی پرسیاری لەبارەوە دەکرێت، دیاری دەکرێت و چەمکەکانی بۆ دادەنرێت، هەروەها لە نێو ئەوەی پرسیاری لەبارەوە دەکرێت، ئەو بابەتەشی تیادایە، کە پرسیارکردنەکە دەدۆزێتەوە، ئەمە مەبەستی پرسیاکردنە. لێرەدا توێژینەوە بە ئامانجەکەی دەگات، خودی توێژینەوە هەڵوێستی پرسیارەکەیە، بابەتەکەشی وەکو شتێک خەسڵەتی بوونی خۆی هەیە، دەشێ کەسێک بە سەرپێییەوە یان بە ئاشکرایی پرسیارەکە بکات، ئەوەی لە حاڵەتی دووهەمدا نائاساییە، ئەوەیە تاکو هەموو خەسڵەتەکانی پرسیارکردنەکە دەرنەکەون، پرسیارکردنەکە ئاشکرا نابێت.

دەبێت پرسیار سەبارەت بە واتای هونەرمەند بکەین، پێویستە ڕوبەڕووی ئەو خاڵە بونیادییانە بینەوە، کە جێی مشتومڕە. ئەمەش درێژخایاندنێکی زۆری بەدوادا دێت، زۆر ڕێگەپێدراو نییە، زۆر لەگەڵ گۆڤار و ڕۆژنامە و بڵاوکراوە ناوخۆییەکان گونجاو نییە، بۆیە ناچارین چەمکێکی بۆچوونەکان دەستنیشان بکەین و کەمێک جێی پێنوسی خۆمانی تیادا بکەینەوە وەک مافێک بە مێژووی هونەرمەند، وەک توێژینەوە وەکو جۆرێک لە بەدواداگەڕان لە پێش هەموو شتێکدا ئەو شتەی بەدوایدا دەگەڕێین، کە پێویستە ڕێنمایی بکرێین بەو پێیەی واتای هونەرمەند تا ڕادەیەک لە بیرماندایە لە چالاکییەکانماندا شێوازێکی تێگەیشتن لە واتای هونەرمەند هەیە.

بەڵام ئێوە دەزانن هونەرمەند چ واتایەک دەبەخشێت، ئەگەر پرسیاریشتان لێبکرێت ئایا هونەرمەند چییە؟ تێبگەن لە ئاستیدا ڕادەوەستن تەنانەت ئاسۆکەیتان لا دیار نییە، بەڵام ئەم تێگەیشتنە ئاساییە ئاڵۆزەی هونەرمەند هێشتا فاکتۆرە.

لە هەمان کات لێکۆڵینەوە لە بواری هونەرمەند و کارەکانی ئەگەر ڕەخنەئامیز نەبێت و خۆی بۆ هونەر و هونەرمەندی داهاتوو باشترانە ئامادە نەکات، ئەوە کاتێکە چەپڵەلێدان و پیاداهەڵدان یەکسان دەبێت بە ئەستێرەناسی، هەر ئەمەش وایکردووە کە لێکۆڵینەوە وەک جۆرێک لە تێگەیشتن خۆی لە کاڵبوونەوەی وشەدا ببینێتەوە، بە جۆرێک خۆی لە کەساسیی هونەرمەندا نیشان دەدات، چونکە بوونێکی ئیتنۆلۆجی بە خۆیەوە دەبینێت.

کەساس وەکو هونەرمەندی ئاماژە (ناو لێکۆڵینەوە) دەرکەوتنی شتێکە، کە لە نێو لێکۆڵینەوەدا باسی لێوە دەکرێت، ڕێگە بە شتێک دەدات تاکو ببینرێت، ئەو شتەش ئەوەیە، کە لە فەلسەفەدا باس دەکرێت و بە (لۆگۆس) ناوزەند دەکرێت.

واتە لۆگۆس دەنگە (phone)، بە دڵنیاییەوە ئەو دەنگەیە، کە شتێکی لێوە دەردەکەوێت. ئەگەر بخرێتە بەر هێزی پاڵنەری ئیتنۆلۆژییانە، سوودێکی گەورەی زانستی بە دەستەوە دەدات. لێرەدا هونەرمەند فاکتۆری بابەتە زانستییەکەیە.

ئێستا لێکۆڵینەوە لەسەر هونەری بەرگری لە زۆر وڵات زۆر چەشن بە خۆیەوە دەبینێت، بریتیشییەکان (بەریتانییەکان) پێی دەڵێن (martial arts)، فارسەکان پێی دەڵێن (هنرهای رزمی)، ئەمریکییەکان پێی دەڵێن (ماشەلایتس) عەرەبەکان بەتایبەتی میسرییەکان کە لە سەرەتای ئەم بابەتەدان، پێی دەڵێن (فنون دفاع عن النفس)، بەو مانایەی کە سێ جۆر قاڵب لە هونەری مۆسیقادا هەیە (میللی، جاز، ئۆرکست). بۆ هەر یەکێک لەم قاڵبانە ئامێری تایبەتی دروستکراوی خۆی هەیە، تێکەڵکردنی ئامێری هەر یەکێک لەم قاڵبانە لەگەڵ ئامێری قاڵبێکی تر پلەی ماشەلایتس لەسەر هەموو بەشدارانی بەرهەمەکە بەرز دەکاتەوە. تا پلەی ماشەلایتس لەسەر بەرهەمەکە زیاد بێت، بەها و مۆرکی بەرهەمەکە و هێزی مانەوەی کەم دەکات، کاڵچەری نەتەوە لاواز دەبێت، بۆ نموونە شمشاڵ و عود دوو ئامێری میللیین، ڤیۆلینە (کەمانچە) و ڤیولا (لە کەمانچە گەورەتر) دوو ئامێری ئۆرکستین، گیتار و بانگوز و سایزەر سەر بە قاڵبی (جاز)ن.

ئەگەر زانست ڕەچاو نەکرێت و لەپێناو بەرگریکردن

لە خۆمان ئەم ئامێرانە بەیەکەوە هەڕەمەکی (ئابەترەری-arbitrary) لە بەرهەمێکدا بەکار بهێنین... واتە ماشەڵایتسمان لەسەر خۆمان زیاد کرد، واتە هونەرمان بەکار هێنا وەک بەرگری لە خۆمان، واتە هونەرمان وەک قاڵب لە بەکارهێنانی ئامێر هەڵە بەکار هێنا، واتە تەنها بەرگریمان لە خۆمان کرد.

ئێستا لە کوردستانی باشوور بەرهەمی هونەری مۆسیقای (لۆگۆس) ناخێکی مێژووی درێژەپێدانی سەرەتای ساڵەکانی هەفتاکانی هەیە. ماشەڵایتس ئێستا لە کلیپەکان لە ناخۆشیی دەنگ و مۆسیقا و جوانیی وێنە بە ڕازاندنەوەی کچ زیاتر خۆی دەخاتە ڕوو، ئەمە سەرەڕای تێنەگەیشتن لە وشەی گۆرانیی قاڵبی میللی (بە چاوپۆشین لە هونەرمەندی ئاماژە -کەریم کابان- کە ڕۆڵێکی جوانی نموونەیی لە تێگەیشتن و پرمانایی لە جووڵەی دەست و دانان

بە وشەی گورانیدا هەیە، کە مەرجی دەنگبێژی سەرکەوتووە).

کەچی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، بە پێچەوانەوە، لەسەر ئاستی میللی ماشەڵایتس (هنرهای ڕزمی) بەرەو کەمبوونەوە دەڕوات، ئەویش بە هۆی بەکارهێنانی ئامێری میلليی کتومت لە قاڵبی میللی (کامکارەکان)، کە لە هەموو ڕوویەکەوە کەمیی داهاتی هونەرمەند و نەبوونی هەلی ڕەخساو، نەزانینی ئامێری مۆسیقا لە لایەن دەنگبێژ، نەبوونی زانست لە مۆسیقزان و تەمەڵبوونی هۆکاری هەموو کەساسییەکە، بەڵام لە هەموو بوونەکان ناتوانرێت پێگەی هونەرمەند فەرامۆش بکرێت، ئەو هونەرمەندانەی کە بوون بە سەرقافڵەی دەستپێکردنی سەردەمی ڕێنیسانس، وەک هونەرمەندی بەڕێزی نێو لێکۆڵینەوە و هەموو دەنگبێژانی سەردەمی خۆی و تیپی مۆسیقا گەورەی ئەو سەردەمە (تیپی مۆسیقای شار)، کە بوونە فینۆمینەی هونەری مۆسیقا و مێژوو چەمکێکی درەوشاوەی پێبەخشین، بوونە فاکتەر بوو لێکۆڵینەوە و چوونە تێبینیداری، لە

فەلسەفەدا ناو دەبرێن بە (فینۆمینەکان) لە زمانی یۆنانیدا واتە ئەوشتەی ئەتوانێت خۆی دەربخات، دەرخستن و دەرکەوتن دەنگێکی ناوەندە کە لە وشەی (phaino)وە پەیدا بووە، لە هونەردا شازە، لە سروشتی مرۆڤدا هەڵدەقوڵێت.
هەر شتێک لە بوونیدا پێویستی بە هیچ نەبوو، ئەو شتە پڕبەواتا شازە کە خەسڵەتی مانەوە و بەردەوامبوونی هەیە، کە دەنگە، دەبێت بە پێکهاتەی بوونی ڕاستەقینەی هەبووەکان. (هونەرمەند) لە نێو جیهاندا دەکەوێتە بەر ڕۆشنایی ئەزموونەکان. ئەوەی بەردەوام دەمێنێتەوە، شتێکی ڕاستەقینەیە، بابەتی هونەرە کە لە هونەری مۆسیقادا بە ماتماتیک دەناسرێت لە خایاندنی کاتە هەمەجۆرەکان چەندییانە و چۆنییانە، لە مێژوودا هونەرمەند هەبوویەکە ماتماتیک دەیەوێت بیزانێت، وەک بوونی جیهان وەکو بیرۆکەیەکی دیاریکراوی بوون لە نێو چەمکی جەوهەرێتیدا دەناسرێت. ناسینەکە تا ڕادەیەک ئیتنۆلۆجیانە دەناسرێت.
لە ئەنجامی شیکردنەوەیەکی تێبینیاوی وردەکارییە ناوخۆییەکان، لە نێوان هونەرمەندی ناوبراو و تیپی

مۆسیقای شاری کارکردوو لەگەڵ هونەرمەند، دەگەینە ئەو ئامانجەی کە خەسڵەتی هونەرمەند و کەسانی دیکە بوونگەرانە بخەینە ڕوو. دەردەکەوێت لە نێو دەوروبەرەکەدا کەسانی دیکە کە بەو جۆرەی هەن، دەناسرێن یان (ئەوەن کە دەیکەن)، جۆرە نیگەرانییەک بەرامبەر کەسانی دەوروبەری هونەرمەند بە بەردەوامی لە مێژووی کارە هونەرییەکانی بەدەردەکەوێت. هەرچی هونەرمەندە دەنگبێژەکەیە، ویستوویەتی خۆی بەرامبەر ئەوان دابنێت یان ڕەتیان بکات یان لەگەڵیان کار بکات. جیاوازی و ململانێ لە نێوانیان چەند پەرەی سەندبێت، نیگەرانی و پەشێوی ئەوەندە بۆ هەردوولا دروست بووە. ئەگەر بوونگەرانە ئەم نیگەرانییە شی بکەینەوە، ململانێکە خەسڵەتی دووری یان دوورکەوتنەوە لە یەکتری لەخۆ دەگرێت. چەند ئەم بوونەی هونەرمەند ڕۆژانی خۆی دوور بخات، ئەوەندەش ملهوڕانە خۆی دوور دەخاتەوە، لەم دوورکەوتنەوەیەدا کە ڕوو دەدات لە نێوان دەنگبێژ و تیپی شار، ئەوەندە کەسانی تر شوێنی دەنگبێژە کەساسەکە دەگرنەوە بە

مەرایی و وشەی بریقەدار و تیزمەبوونی هاوبیر. سەیرە، چیدی دەنگبێژ ناتوانێت ببێت بە خودی هونەرمەند خۆی، کەسانی دیکە شوێنەکەی داگیر دەکەن، ئەگەرەکان ژیانیشی دەکەونە بەردەست کەسانی دیکە. ئەوانیش بە ئارەزووی خۆیان تیپی شار هەڵدەسووڕێنن. ئەم کەسانە بوونێکی دیاریکراویان نییە، هەر یەکێکیان کەسێکی دیکە بوونی دیاری دەکات لە ڕێی ئۆرگانی تایبەت، نهێنییانە و هەندەکییانە و هەمەکییانە.
ئەوە ئاشکرایە دەنگبێژە کەساسەکە لەم پەیوەندییە نهێنیدارەی نێوان تیپ و کەسانی دیکە ئاگادار نییە. بوون دەبێت بە بوونێک بۆ بەهێزبوونی ئەوانیتر. کەسانی دیکە و ئەوان دەبنە هێزێکی پاڵنەر بۆ یەکتری و دەتوێنەوە بەسەر یەکدی و بوونیان دەبێتە حەتمیەت، کە خودی ژیان و دروستیی ژیان ئەم پێکهاتەیەی دروست کردووە، کە فەرمانەکە لە لایەن مێژووەوە دراوە. ئەم پێکهاتە تواوەیە بە تەواوی هونەرمەند بەرەو ماندووبون و هیلاکی و پیری دەبات.
بەڵێ پیر دەبێت، چونکە ئەوان بوونە دروستکراوە نیگەرانەکەی خۆیان دەکەنە بنەمایەکی بنەڕەتی و بە فاکتور لە ژیانی ڕۆژانەدا دەمێننەوە، بڕیار لەسەر هەموو بوونێکی ڕاستی و ناڕاستی، خوشی و ناخۆشی، زانستی و هەڕەمەکی، سەرکەوتن و ڕووخاندن دەدەن، لە ڕۆژێکدا ئەوەی کە گەندەڵە و ناهەموارە، کە ناخۆشە و سەپێنەرە کە بێتامە و نەویستە، بریقەداری دەکەن و دەری دەخەن، کۆرسێکی ڕەنگاوڕەنگی کوڕان و کچانی بۆ ئامادە دەکەن، وەک شاکاری هونەر و یەزدانی هونەر، لێپرسراو بە بودجەی باشەوە بە خۆیان پەریشان دەکەن، هۆڵی ڕازاوە و پاسەوان و چاودێری هۆڵ، کارتی میوانداری، پێشوازیکەران، وێنەگرتن لە سێ لای هۆڵ بە کامیرای تی ڤی (TV) ئامادە دەکەن. ئیتر ئاواتەکانی دەنگبێژی بەرامبەریان تونا دەکەن، مردنی ئاواتەکانی هونەرمەند و تەفروتوناکردنی ون دەکەن و لە ژیر ئالآی بەگشتیکردن هەموو شتێکی ڕاڤەکراوی هونەرمەند و جهان داگیر دەکەن. چەند ئاستەمە، کەس دەرک بەم نهێنییانە ناکات و هەموو ڕاستییەک کپ دەکەن.
چەند ئاستەمە فێڵ لە مێژووش دەکەن و کوێری دەکەن، ڕاستی و مێژووی هونەرمەند وێڵ دەکەن، هەمووشتێک دەبێت بە ڕازاوە و دیار، کەچی بەرهەم ون و وەستاو و کوێر دەکەن. کەس نابێت مۆسیقا لێبدات، هونەرمەندی نوێ داخ دەکەن، شوێنی داخ دیار نییە و دەروونی داگیر دەکەن. لە تیپی شار بەولاوە نابێت هیچ جووڵەیەکی تر دروست بێت و لاوان ئامۆژگاری دەکەن، هیوای سبەینێی بریقەداریان پێدەدەن، ماندوویان دەکەن، خۆ ئەگەر مۆسیقازانێک لە فەرمانیان لا بدات، دونیای لێ هار دەکەن. هەموو ئۆرگانە نهێنییەکان بە فیتنە و فێڵیان کار دەکەن. دەنگبێژی ئاماژەدراویش بە ماتۆرسکیل جاڕ دەکەن، دەکەن، دەکەن، هەموو شتێک دەکەن، چەندەهای وەک من بە قەڵەم لە خۆیان هار دەکەن، کە هار دەبیت، بێدەنگ دەبن، کەمتر خەڵک بزانێت، بێوەیتر ئەبن، خۆیان ڕاست نیشان دەدەن، کە ئەم جاڕدانە پەیوەندیی بەوانەوە نییە، ئێمە شێت نیشان دەدەن، بە زۆر زەردەخەنەیەکی گاڵتە لە ڕوویان دروست دەکەن و دوایی وەک دووپشک پێتەوە دەدەن.
سەیرە ئەم تیپە زەبەلاحە چ کابووسێکە و هونەرمەند جەزرەبە دەدەن، هەرگیز خۆیان بە کرۆکی کێشەکان ناگەیەنن. لە ڕێی بەگشتیکردن هەموو شتێک ئاڵۆز و شاراوە دەکەن، دوایش خۆیان ناو دەنێن بێگەردی مێژوو، شتە داپۆشراوەکان ئاشنا دەکەن و لە ژیانی ڕۆژانەدا ئاشکرای دەکەن. بۆ خوێی چێشت تامی دەکەن، پاشان کە کۆچی کرد، یادی دەکەن، ئەم

هونەرمەندەش هەر وا لێدەکەن،
ئەمانە لە ڕێی هەموو ئۆرگانەکان لە هەموو شوێنێکدا هەن، هەموو ئاوات و چالاکییەکی هونەرمەند دەفڕێنن، مادام ئەوان بڕیار لەسەر چالاکییە هونەرییە مۆسیقییەکان دەدەن، ئەم دەنگبێژە کەساسەش لە وەڵامدانەوە بێبەری دەکەن. بەڵی ئەوانەی کە ئەم کارانە بەرامبەر هونەر و ژیانی ڕۆژانەی هونەرمەند دەکەن، هەر بەردەوامن، بە شێوەیەک ئەوەی شتەکان دێنێتە پێش، کەسێکی ناسراو نییە، بە جۆرێک باری گران لەسەر هونەرمەند سووک دەکەن، لەمەش زیاتر لەگەڵ سووککردنی بارەکە هەڵسوکەوتی شیاوی لەگەڵدا دەکەن.

بەم جۆرە، هونەرمەند دەخەنە نێو خۆیانەوە و فێری دەکەن شتەکان ئاسان وەربگرێت. بەم کارە، ئەوان خۆیان دەهێڵنەوە و سەختتر خۆیان دەسەپێنن، هەموو کەسێک دەبێت بە ئەوان و کەس نابێت بە بوونی خۆی.

کاتێک کە ئەوان هیچ کەس نین، هونەرمەند لە ناویاندا خۆی بە دەستیانەوە داوە، لە نێو ئەم خەسڵەتگەلانەدا ژیانی ڕۆژانەی بوون لەگەڵ یەکتریدا نارەسەنانە دەکەوێتە ڕوو لە زەردەخەنەی دروستکراو، سەرجووڵاندن لە باتی وشەی وایە، هەموو ڕۆژێ سەد جار لەم بونەدا هونەرمەند تیزمە ئەبێت بە داکەوتوویی (collapse).

هەرچەندە ئەوان وەک بابەتێکی دەرەکی کەم دەبینرێن، لە هەمانکات ناگیرێن، بەڵام بە ئاشکرایی ڕۆڵی خۆیان دەبینن، لەگەڵ ئەمەشدا ئەوان هیچ نین ئەگەر بێلایەنانە و (ئۆنتیکۆ – ئیتنۆلۆجیانە) بڕوانین، ئەو کاتە ئەوان بە خۆیەکی ڕیالیستیانەی ڕۆژانە دادەنێین، ئەگەر وەکو بەردێکیش کە بابەتێکی دەرەکییە نەبینرێن، ئەوە ناگەیەنێت کە ئەمانە شتێکی ڕاستەقینەنین، کەس لە پێشوەختدا حوکمی نەبوونی ئەوان نادات، لە هەمان کات ناتوانرێت ئیتنۆلۆجییانە ڕاڤە بکات، دەبێت ئەم دیاردە سەپێنراوانە ڕێنمایی بەکارهێنانی چەمکەکانی بوون بکات.

ئەوان خۆیەک نین وەکو خۆیە فرەجۆرەکانی دەرەوە هەڵواسرێن، یان دەستنیشان بکرێن، لەم حاڵەتەدا بوونی ئەم خۆیانە و دانانیان بە جۆری

گەورە دەبێت، ئەگەر خەسڵەتی هونەرمەندێتییان هەبێت، وردە وردە لە دەستیان دەچێت. پێگەیان کەم دەبێت و دەکەونە ناو بازنەی (شێوە) لە هونەر و ئیتر خەسڵەتی بوونیان لەسەر جۆری گەورە و بچووک بلیمەت و مامناوەند توانا و بێتوانا ڕادەوەستێت.

ئەم شیکردنەوە ئیتنۆلۆجییە توندڕەوە گرنگ نییە چەند لۆجیک پێش بخات و گرنگی پێبدات، یان گۆڕانکاریی بەسەردا بهێنێت، هەرلە بنەڕەتەوە نەرمی و خۆگونجاندنی تیادا نییە. چاکسازی لە لۆجیکدا و وەرگێرانی بەرەو زانستە مرۆڤییەکان دەبێتە هۆکاری ئاڵوزیی ئیتنۆلۆجییانە، ئەوان کە لە ململانێدان لەگەڵ دەنگبێژ یان هونەرمەند، پێشمەرجێکی ئیتنۆلۆجین وەکو دیاردەیەکی سەرەکیی سەر بە پێکهاتەی پۆزەتیڤانەی هونەرمەند.

چەند ئەگەرێکیان بۆ بەکۆنرێتکردنی خۆیان هەڵگرتووە، ڕادەی داگیرکردنەکە و خۆسەپاندنکە دەگۆڕێت، هونەرمەند کە لە ناو ئەوان توێنراوەتەوە، یان پەرت و بڵاو کراوەتەوە لە هەمان کاتدا پێویستە خۆی بدۆزێتەوە. پەرتو بڵاوییەکەی ئاماژە بۆ هەبوویەک دەکات. بە نیگەرانییەوە کە لە نێو جیهاندا نوقم بووە، ئێمە لە نزیکەوە ڕووبەڕووی دەبینەوە.

ئەگەر هونەرمەند خۆی وەکو خۆی ئەوان بناسێت، ئەو کاتە ئاشنابوون و کارکردنی ڕۆژانەی هونەرمەند لەگەڵ دەوروبەر دەکەوێتە سەر ئاشنابوون و کارکردنی ئەوان، ئیتر چیدی هونەرمەند خۆی دەدۆزێتەوە، ئەمەش دۆزینەوەی جیهان و هونەرەکەی خۆیەتی، دەبێتە ڕامالینی ڕێگرەکان و کردنەوەی ڕێگاکان.

تێبینیە ئیتنۆلۆجییەکان تێگەیشتنێکی کونکرێتییە بۆ بوونی پێکهاتەی بنەڕەتی هونەرمەند. دەبێت دامەزراندنی لە نێو جیهان لە ژیانی ڕۆژانەدا و لە کاری هونەری پیرۆزدا دەربکەوێت، ئیتر شێواز دەگۆڕێت و پیشمەرجی ئیتنۆلۆجییانەش دەکەوێت. بەڵام بە داخەوە لە هەموو ئەم بێنەوبەرەیەدا هونەرمەند پیر دەبێت، لەشێکی لاواز و بێدان، ئیتر توانای هیچ شتێکی نامێنێت، بەڵام لە هەموو کەسانی تر بەجورئەتترە بۆ بەگژداچوونەوەی ناڕاستییەکان. چونکە ئەو هەرنوێ دەبێتەوە، پزیسکەکەی لە وەچەیەکەوە دەگوازرێتەوە بۆ ئەوی دی.

ئاگادار بن لێکۆڵینەوە وا پێویست ئەکات کە پەنا بۆ وشەی ڕاستەوخۆ ببرێت، کە خاوەندارییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ فەلسەفە، ئەوان ئاگاداری هەموو شتێکن، ئەگەر وا نەبووایە، (بۆرخیس) نەیدەگوت هەموو شتێک دەمرێت تەنها مێژوو نەبێت، کە فەلسەفە لە ناخیدا قوڵپ دەدات، کەشکۆڵێک ئەدەب و هونەری جیهانیی تیادایە، هەموو هونەرمەندان تەنانەت بە ڕامیاریداریشەوە لە ڕێکی وتار بوونیان هەیە، هەموویان هونەرمەندن.

ئاگاداربن زەردەشت ئامۆژگاریمان دەکات هونەرمەند لە چاڵێکی قووڵ دەچێت، بەردتێفڕێدانی ئاسانە، بەڵام کاتێک گەیشتە قووڵایی چاڵ، کێ دەتوانێ دەری بیهێنێت، ئەو بۆ سەرکەوتن و ڕاستییەکانی خۆی زۆر پیر دەبێت منداڵێک دەستی دەگرێت، ئیتر مافی هێنانە سەر زمانی هەر ڕاستییەکی نییە کەچی خەڵکان ئاسایی دەوێرن دەربارەی توندوتیژی قسە بکەن، بەڵام کەس وەک هونەرمەند جورئەتی ئەوەی نییە دەربارەی توندوتیژی بیر بکاتەوە، کە سەرئەنجامی ئەندێشەکردنی فراوان بیرمەندییە، کە دواچارەنوزسی هونەرمەندە.

خۆتان شادمان بکەن، ئازاردانی کەسانی تر و ئەندێشەی ئازاردان زیاتر لەبیر دەکەن.

# کابانی گۆرانیی کوردی

**دیاری قەرەداغی**

نووسینەوەی مێژووی کارکردنی هونەرمەندێکی بەئەزموون و گەورەی وەک هونەرمەند کەریم کابان هەوڵێکی گەورە و پیرۆز و جدییە. ڕەنگە ئەو چانسە هەبێ کە کەسانێک هەبن و توانا و تاقەتی ئەوەیان هەبێ بە سوپاس و دەستخۆشییەوە ئەم کارە لە ئەستۆی خۆیان بگرن. بەڵام ئەم بەشە نووسینە کورتەی من، نە گێڕانەوەی ئەو مێژووە پرشنگدار و پڕ بەخششەیە و نە بەیانکردنی سات و زەمەن و شوێن و یادەوەریی بەرهەمەکانییەتی، هێندەی قسەکردنێکە لەسەر توانا و ستاتیکای هونەریی و تازەگەری لە ڕۆژگارێکدا، کە هیچ شتێک تازە نەبووە. ئەو ڕەهەندی قسەکردنە لە میتۆدی کارەکانی هونەرمەند کەریم کابان لەوەوە سەرچاوەی گرتووە، کە ئە

هونەرمەندێک بوو هات و خۆی نەکرد بە هاوتای گوێگرانی کورد لەو سەردەمەدا، پێی وتن لە دەرەوەی مەعریفە و زانینی ئێوە زۆر شتی زیاتر هەن و دەگوزەرێن. چونکە هاوشانی ئەمان، ئەو تیپە مۆسیقییانەی لەو دەمەدا خۆیان کۆ کردەوە و موزیکی گوند و شارۆچکەکانیان بە شار گەیاند و پەیامی بەرگێکی تازەی شارییانەیان پۆشی.. بۆیە دەبوو چەند دەنگێکی وەک کابان و گەرمیانی و قەرەداخی و ئیبراهیم خەیات ببنە کەرەسەیەکی تازە و زیندوو بۆ بەرجەستەکردنی ئەم نوێبونەوەیە.
کەریم کابان ئەو دەنگە جودا و سەرکەشەی ئەو دەمە بوو تا ئێستا، کە خەسڵەتی دەنگێکی تۆن جیاواز و هێمن بوو و هەڵگری حوزن و ڕۆمانسێکی تایبەت بوو. نمایشبوونی ئەو دەنگە چەند پێویستی بوو، ئەوەندەش سەرکێشی و ڕیسک بوو، چونکە تایبەتمەندی و زەنگۆڵەی ئەم جۆرە دەنگانە نامۆ بوون بە گوێی جەماوەرێک کە هەمیشە ڕاهاتووی چینە بەرزە دەنگییەکانی چەشنی سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی و تایەر تۆفیق و سێوە بوون.. لە لایەکی ترەوە، زۆرینەی گۆرانیی ئەو سەردەمە مامەڵەکردن بوو لەگەڵ گەلەری و فۆلکلور و میللییەکان و کەمتر خود ئاوازییەکان، کە زادەی هونەرمەند بن کە دەبیستران.. بۆ نموونە، گۆرانییەکانی ماملێ و زیرەک و خالقی پشکی شێریان هەبوو لە بیستن و شەیدابوون و ئالوودەبوونی گوێگرانی کورد، کە سیمای زۆرێک لەم گۆرانییانە فۆلکلۆریی و ناوچەیی بوون.. ئاوازی میللی و کۆن بوون، کەمیان ئاوازێک بوون کە دانراو بن، هەندێکێشیان هاوردەی هەندێک ئاوازی ئازەری و نەتەوەکانی چواردەور بوون، کە بۆنی تازە و ئاوازی نوێیان لێدەهات بۆ گوێگری کورد. بۆیە دەرکەوتنی (کابان) لەو سەردەمەدا خۆشییەک بوو، خۆشییەک کە لە کاتی خۆیدا تەفسیر نەدەکرا. خەڵکیش تینووی ئەوە بوو گوێبیستی شتێکی نوێ بێ، بە تایبەت چینی ڕۆشنبیران و خوێندکارانی زانکۆی سلێمانیی ئەو کاتە، کە شۆڕشێکی گەورەی کولتووریيان بەبێ مەبەست بەرپا کردبوو لە ستایلی ژیان و دروستبوونی فەزایەکی مەعریفی و هونەریی وەک دروستبوونی دەنگە شیعرییە نوێیەکانی ئەو سەردەمەی چەشنی هەڵمەت و شێرکۆ بێکەس و زۆرێکی تر لە ڕوانگەییەکان و پاش ئەمانیش لوتکەبوونی تیپی مۆسیقای سلێمانی و گەشەی بەرچاوی هونەریی زانکۆی سلێمانی و دەرکەوتنی باندێکی ڕۆژئاوایی لە زانکۆی سلیمانی لەسەر دەستی هونەرمەندی پایەدار ئەنوەر قەرەداغی.
ئەمانە فاکتەر بوون و بوێرییان بەخشییە ئەو دەنگانە، کە جودا بن و هەل بڕەخسێ دەربکەون. ئاخر لە کۆنەوە تا ئێستا ئەوەی دەگوزەرێ لە هونەری کوردیدا و جێگەی تێڕامان و هەڵوێستەیە لە ئەو بەردەوامیدانە بە کاری دووبارەبووە و بێکڵاس، کە ئەمەش دیسانەوە فیدباکی دوولایەنەی بۆ سەر وەرگرەکانی هەیە، جارێکیان بێچێژی و لەقالبدانی چێژە ئاستە نزمەکان ڕازی دەکات و ڕەخنەی توند و کەنسلکردنەوەی بەشەکەی تری لێ دەردەکەوێ، کە ئەمەشیان ڕەوایە، چونکە هەمیشە پرسیارێکی جەوهەری دەکەن کە بڵێن: بۆ ئێمە بتوانین چێژ لە فیلم و دراما جدیی و گەورەکانی دنیا ببینین و ئاشنا و هاوتەبای چێژ و فیکر بین لەگەڵ موزیکی هاوچەرخی جیهانی و لێشی بگەین و بەردەوامیش لە نێو ڕیکۆردەری ماڵ و ئۆتۆمبێلەکانمان هەبن و لێبدرێن.
بۆیە هەستیش بەوە کراوە کە ئەو کاتانە سەردەمی زێڕینی گوێگرتن بوون لە گۆرانیبێژانی غەیرە کورد وەک (حسەن بەنان و شەهیدی و گوڵپا و محەمەد وەهاب و فەرید و حەلیم و ئەسمهان.. هتد) هەموو ئەم دەنگانەش بە ئاسانی نیشاونەتەوە بە دڵ و هەست و ویژدانی گوێگرانی کورد و قبوڵ کراون لەگەڵ ئەوەی کە کوردیش نەبوون.. بۆیە هاتنەناوەوی دەنگێکی وەک کەریم کابان توانیی ئەڵتەرناتیڤێکی کوردی بێ لەو سەردەمەدا. هەر بۆیە

گۆرانی (شەو) بووە وەچەرخانێکی هونەریی، کە هاوسەنگی گوێگرتنی کوردی ڕابگرێ و هاوتای ڕێژەی گویگرتنی گۆرانییە کوردییە کۆنەکان و بیگانەکان بێتەوە. من ناڵیم ئەمە دەستپێک و سەرەتایە، ناشڵێم زۆر هونەریی بوون، بەڵام بە لەچاوگرتنی هەلومەرج و ئاستی ژیانی و ژیاریی کۆمەڵ، بابەتگەلێکی تازە بوو.. پڕی بوو لە نوێکاری بۆ ئەو سەردەمە.

یەکێک لە تایبەتمەندییە هونەرییەکانی ئەم هونەرمەندە پایەبەرزە.. بەردەوامی بوو لە یەک ئاستدا و نوچنەدانی بوو لە بەردەم شەپۆلەکانی پێش خۆی و دوای خۆی، ئەویش بە کەشفکردنی هەستەکانی خۆی و توانەوەی لە دوو توێ (ئاواز)دا ئەگەرچی زانستی موزیکی نەزانیووە و بە ئەکادیمی بە کۆی شتەکان نەگەیشتووە بەڵام هەست و هەڵچوون و ئامانجە هونەرییەکەی یەکسان بووەتەوە بەوەی وا هەست بکەین لە پشت دانانی ئەم (ئاواز)انە کەسێکی ئەکادیمی هەن.. ئاوازەکان یەکهێڵی و ئاسۆیی نین و پێویست بەوە دەکات توانایەکی هونەریی بە ئەدایەکی هونەریی بیچڕێت، کە کابان لەمەدا پێشڕەوی کردووە و وا هەست ئەکەین وتنەوەی ئاسانە، بەڵام کە دەچینە قووڵایی ئاوازەکە، گەر زۆر شارەزا نەبیت، ناتوانیت زاڵ بیت بەسەر ئەو بەرز و نزمی و شەپۆلە ئاوازییانەدا.

بە بۆچوونی من، ئاوازەکان بەرکەوتنی گەورەیان لەگەڵ وشەی شیعریدا هەیە و دەسەڵاتی دەقە بەرزە شیعرییەکان ناخی جووڵاندووە بۆ دروستکردنی ئەو ڕایەڵە هونەرییە، کە ناخی ئەلاوێنیتەوە، کە هەر جارە لە مەقامێکی تایبەتدا بەستەکانی داناوە، ئەمەش پێمان دەڵێ کە (کابان) شارەزاییەکی باشی لە ڕەنگ و بۆنە و پێکهاتەی (گام)ەکان هەبووە و بەستەکانی لەسەر داناوە و خۆشبەختانەش موزیک هاوچەرخانە هارمۆنی بووە لەگەڵ میلۆدییەکەدا. بۆ نموونە یەکێک لە جوانترین دەستپێکە موزیکییە کوردییەکان (ئینترۆ) لە گۆرانی (شەو)دا هەیە، کە ڕاستەوخۆ هەست بەوە دەکەیت کە توانای جوانیی میلۆدییەکەیە ئەو

هەستەی بەخشیووە بەو هونەرمەندەی موزیکی ئەم بەرهەمەی ئەڕێنج کردووە.
هەمیشە دیاردەی تاکهێڵیی ئاوازەیی لە گۆرانیی کوردیدا بەدی کراوە، کە پشتبەستوو بووە بە ڕستەیەکی سەرەکیی میلۆدی و هەر لێدراوەتەوە بە موزیک و کۆرس و گۆرانیبێژ تا ڕادەی بێزار بوون و سوان.. بەڵام لەم گۆرانییانەی (کەریم کابان)دا هەوڵێک بینرا بۆ خۆقوتارکردن لەم دیاردەیە، کە بە ڕای من ئەمە هەنگاوێکی گەورە بوو.. کە لەوێوە ئاماژەکانی بە(شار)بوونی گۆرانی و تازەبوونەوە و فێربوون و لاسایینەکردنەوە سەریهەڵدا.
لە ڕاستیدا فەلسەفەی ئیشکردنهکەیان لای من وایە کە هەست کرا چیدی کەس بەوە ڕازی نییە بەرهەمێکی هونەریی ببینێ یان ببیستێ لە ئاستێکی هێندە لاواز بێت، کە خاوەن بەرهەمەکە بیەوێ پێمان بڵێ ئیتر ئەمە توانای ئێمەیە و تەواو!! یان بڵێت گرنگ ئەوەیە کارەکانی پێش خۆمان تێپەڕاندووە، هەر زوو لە نێو کارکردنی زۆرینەی هونەرمەندانی کورد دەرک بە کۆمەڵێک شت دەکەی، هەمیشە ئۆباڵی لاوازیی بەرهەمێکی هونەریی خۆیان بۆ کەمیی مەعریفەی جەماوەری بیسەر و بینەر دەگەڕێننەوە، چێژی زۆرینەی وەرگری کوردی بە ئاستنزم و شێواو و بێسەلیقە ناو دەبەن، بە چەشنێک لێدوان دەدەن، کە هەموو کردە هونەرییەکەی ئەوان کە بەرهەمیان هێناوە، لە دەرەوەی توانای چێژ و سەلیقە و فیکرو مەعریفە و لێکدانەوەی ئەوانە، من تەواو پێچەوانەی ئەم ڕایەم، گەرچی زۆر باش ئەوە دەزانم کە هەستی گوێگرتن و بینینی جەماوەر دابەشە بۆ چەند پۆلێنێک، لە ئاستی بەرزەوە بۆ ئاستە نزم و بێکلاسەکان، ئەم بارەش هەر کوردی نەگرتووە، دنیاش وایە و هەمان چەشنە، بەڵام ئەوەی ئێمە لە هونەرمەندانی دنیا جیا دەکاتەوە، (توانا و ئازایەتی و داهێنانە). ئەو کەرەسانەش زادەی فێربوون و ماندووبوونن، لەگەڵ خۆخڵافاندن و پشتکردنەوە و خۆماندوونەکردن نایەنەوە.
لەو هێڵە گرنگانەی ئەمخاتە سەر بیرکردنەوەی زۆر باس و لێکدانەوە کاتێک وەک گوێگرێکی ئاسایی گوێ لە بەرهەمەکانی هونەرمەند کەریم کابان دەگرم.. هەمیشە دەڵێم چەمکی هەڵبژرادن و گەڕان بە دوای جوانیدا دیارترین دوو توخمی سەرەکین لەم هونەرمەندەدا، کە لە ڕاستیدا ئەم دوو خاڵە بەسە بۆ ئەوەی بتباتە لوتکە. ئەگەر هیچ هەلومەرجێکی مێژوویی و توانای مرۆیی و مادیش کۆمەکت نەکا، ئەو دەگەڕێ بە دووی ناخی خۆیدا، کە لە ناخیدا منداڵیکی هەمیشە گەش هەیە یاری بە کۆی شتەکان ئەکات و بزێوانە دەست دەبات بۆ ژانرە ئەدەبییە بەرزەکان بەبێ ئەوەی لە پەرچەکرداری خەڵک و قبوڵکردن و نەکردن بترسێ.
هەمیشە هونەرمەندی داهێنەر پێویستی بەو منداڵە جوانەی ناخێتی، کە نە هێڵی گەورە بێ بۆ ئەوەی بەبێ ترس لەگەڵ کۆی شتە گەورەکانی دنیا یاری بکات، کابان تا ئەم تەمەنەش پارێزگاری لەو گەمە جوانەی ناخی دەکات و ناهێڵێ بمرێ.
درووود بۆ ئەم مەزنە هونەرمەندە.. لێم ببورێ کە دەرفەت و بیرکردنەوەم تەنها چەند سەرە دێرێکی پێ دروست کردم. دەشزانم قەڵەمی من لە ئاستی هونەری تۆدا گەلێک نزمترە.

# هونەرمەند کەریم کابان
# کەی توانای گۆرانی وتنم نەما ئەوسا هەست دەکەم پیر بووم

**ئا: ئیدریس عەلی**

ساڵی 2004 لەگەڵ هاوڕێی کۆچکردووم (ئیدریس شەیداهۆ)ی ڕۆژنامەنووس، پاش بەسەربردنی شەوێکی دوورودرێژ بە گوێگرتن لە گۆرانییەکانی کەریم کابان و خۆدانە دەست شەپۆلە نەرمەکانی مەستبوون، بڕیارمان دا هەرچۆنێک بێت، بۆ سبەینێ چاوپێکەوتنێکی لەگەڵدا ساز بکەین، پاش ئەوەی پەیوەندیمان پێوە کرد، ئەویش خۆشحاڵیی خۆی دەربڕی و وتی: ئاڵای ئازادی ڕۆژنامەیەکی چاکە و چی پرسیارتان هەیە، بیکەن و من وەڵامتان دەدەمەوە. ئیدی لەگەڵ شەیداهۆی جوانەمەرگ، دووقۆڵی کەوتینە پرسیار و گوێگرتن لە وەڵامەکانی ئەو.

– سەردەمی منداڵی ناسکترین و پڕ بیرەوەریترین تافی ژیانە، کەریم کابان منداڵێتیی چۆن بەسەر بردووە؟

**کەریم کابان**: ئەو دەمە من منداڵ بووم، نەمدەزانی دەنگخۆشی چییە، ڕۆژێک لە پۆلی چواری سەرەتایی، وا بزانم ساڵی (1938) بوو، بۆ یەکەم جار بەرامبەر مامۆستاکەمان سروودی (ڕاچڵەکین و وریابوونەوە)م وت، ئەوسا وابوو، قوتابی زۆر ڕێزی لە مامۆستا دەگرت، منیش کە سروودەکەم

وت، هەمووگیانم دەلەرزی. مامۆستا لێم هاتە پێش و وتی تۆ دەنگت هێندە خۆشە بۆ قسە ناکەی؟ بۆ بەیانی منی خستە ناو ڕیزی (تیپی سروودی قوتابخانەکان). ئەمە سەرەتای هاتنەدونیای کاری هونەریم بوو.

من لە خێزانێکی نیمچەهونەریی پەروەردە بووم، باوکم دەنگی زۆر خۆش بوو (جەلال کابان) دەفێکی هەبوو، مەولوودی دەخوێند. جاری واش هەبوو لەگەڵ چەند برادەرێکی خۆی شەوانە ئەهاتنە ماڵی خۆمان شەوبازیمان دەکرد، یەکێ لەوانە (ئەحەی محەی جگەر) و (عەلی خەلیفە) بوون، دائەنیشتن دەفیان لێدەدا و شیعری تەسەوفیان ئەوت. هەندێ جاریش شیعری عاتفییان دەوت. جا من و شەهید (قادر کابان)ی برام لەو کەشوهەوایە گەورە بووین و کاریگەریی هەبووە لەسەر ژیانی هونەریمان. لەبەر ئەوە، هونەر بووە بە خولیامان و لێمان جیا نابێتەوە.

لە ساڵانی جەنگی جیهانی دووەمدا شاری سلیمانی ئێستگەیەکی ناوچەیی لێدانرا، ئینگلیزەکان بۆ هەواڵ و پروپاگەندەی شەڕی جیهانی دایاننابوو، ئێستگە بریتی بوو لە ئەمپریفایەرێک و مایکرۆفۆنێک، چەند بڵندگۆیەکیشیان لە سێ چایخانە و ناوبازاریش دانا، چایخانەی (حەموەتۆڵە) و (حەمە ڕەقە) و چایخانەیەکی تر بوو، چوار بڵندگۆش لەسەر چەتری پۆلیسی هاتوچۆی بەردەرکی سەرا دانرابوون، ئەوسا هەموو سلێمانی چەند ئوتومبێلێکی تێدا بوو، شەوانە خەڵکی حەسیریان دەهێنا و لەسەر شۆستەی بەردەکی سەرا دادەنیشتن و گوێیان لە هەواڵ و گۆرانی دەگرت. چوار بڵندگۆکە، یەکێکیان ڕووی لە کانیسکان و یەکێک بۆ (سەرشەقام) و یەکێک بۆ (سابونکەران) و یەکێ بۆ (مەڵکەندی و گۆیژە) بوو. من بە نووسراوێکی مودیری مەعاریف نێردرامە ئەو ئێستگەیە و گۆرانیم دەوت. خەڵکی زۆریش ئەهاتنە بەردەم سەرا و تەکلیفیان لێدەکردم کە ئەم گۆرانییە یا ئەو گۆرانییە بڵێم.

– سایکۆلۆژیەت و سروشتی مرۆڤ وایە، خولیایەکی سیحری دروست دەبێ بۆ گەڕانەوە بۆ سەردەمی منداڵی، ئەو منداڵییە چەند ڕەنگی داوەتەوە لە هونەرەکەتدا؟

کەریم کابان: کە بیر لە ڕابردوو دەکەمەوە، ساتێکی زۆر پیرۆزە و دەمێک دەکەومە نێو خەیاڵی ڕۆژانی زوو.

– مەبەستم ئەوەیە لە ژیانی هونەریتدا ڕەنگی نەداوەتەوە؟

**کەریم کابان**: من لە کاری هونەریدا، ئێستاش گەنجم، ئاوازی تازەم هەیە، بە نیازی بەرهەمی تازەم، شیعری گەنجی ئەم سەردەمەم هەڵبژاردووە، شیعری (ئەحمەد محەمەد)ی شاعیر.. ئەگەر تەمەن ڕێگە بدا شیعری، (شاری خەزان) تۆمار دەکەم. کە شیعرەکەش باس لە تەمەن دەکات.

بە ڕای من دانانی گۆرانی و ئاواز مەسئولیەتی خۆی هەیە، گرنگی خۆی هەیە، چونکە نوێنەرایەتیی هونەری میللەتێک دەکا، ناکرێ کارێک بکەی سەقەت بێ، چونکە ڕووزەردی بەردەم هونەری میللەتێک دەبین.

– یەکەم بەرهەمت کە تۆی بە خەڵک ناساند، چی بوو؟

**کەریم کابان**: لە ساڵی (1954) لە بەغدا، کە بۆ کاری تایبەتی خۆم چووم (حەسەن زیرەک) م بینی، بۆ بەیانییەکەی چوومە ئێستگەی بەغدا، لەوێ کاسێتێکم تۆمار کرد، کە هەشت گۆرانی بوو، سیانیان ئاوازی خۆم بوون.

یەکەم بەرهەم کە منی ناساند، لە ساڵی 1974دا لە شاخ لەگەڵ تیپی مۆسیقای شۆڕش لە دێی (وەسان) هەردوو گۆرانی (یاران وەسەتم) و (شەو)م تۆمار کرد و شەوی 11/9/1974 لە یادی هەڵگیرساندنی شۆڕشی ئەیلوول ئەو دوو گۆرانییە بڵاو بوونەوە و زۆر بە خێراییش خۆیان ناساند و خەڵکێکی زۆر ڕۆژانە گوێی لێدەگرتن..

ئەم دوو گۆرانییە سەرکەوتنی چاکیان بە دەست هێنا، پاشان جارێکی تر لە شاری سلێمانی بە شێوەیەکی تازە لە ساڵی 1976دا تۆمارم کردنەوە. دواتر لە ڕێگەی شاشەی تەلەفیزیۆنی کەرکوکەوە زیاتر بە خەڵک ئاشنا بوون.

- مامۆستا لە بۆنە نیشتیمانی و نەتەوەییەکاندا سرووودت نەوتووە؟

**کەریم کابان**: ڕاستییەک هەیە حەز دەکەم بیڵێم. نامەوێ غەدر لە هونەر بکەم، دەنگی من دەنگی سروود نییە، دەنگی سروود دەبێ بەهێز و کاریگەر بێ، کە من ئەو دەنگەم نەبێ، نەمتوانیووە و نەمویستووە ئەم هونەرە بەرزە بشێوێنم. دەنگی من دەنگێکی عاتیفییە، من هەمیشە بە ڕۆح لەگەڵ سروود و شۆڕشەکاندا ژیاوم، بەڵام چی بکەم نەمتوانیووە سروود بڵێم.

- شیعری گۆرانییەکانت تایبەتمەندیی خۆی هەیە. تۆ چۆن و بە چ شێوەیەک شیعر بۆ گۆرانییەکانت هەڵدەبژێری؟

**کەریم کابان**: من شیعری شاعیرە کلاسیکیەکانم زیاتر بە لاوە خۆشە، پاشان کە شیعرێکم هەڵبژارد، تەنها ڕای خۆم ناسەپێنم، پیشانی چەند کەسێکی شارەزای دەدەم، ئەگەر هەمووومان ڕامان لەسەری باش بوو، ئینجا کاری لەسەر دەکەم و ئاوازەکەش بە هەمان شێوە بۆ چەند کەسێکی شارەزا دەڵێم، هەر لە خۆمەوە بڕیاری لەسەر نادەم. خۆشبەختانە، زۆربەی جار ئەوانەی ئاوازەکەم یا شیعرەکەم

بۆ وتوون، زەوقی هونەرییان زۆر جوان بووە، بۆیە دەتوانم بڵێم زۆربەی کارەکانم سەرکەتوو بوون، بەو پێیەی جەماوەرێکی زۆریان هەبووە.

– جاران مۆسیقا و کاری تۆمارکردن چۆن بوو؟
**کەریم کابان**: بیرمە لە ساڵی چلەکاندا، مۆسیقی زۆر کەم بوو، بە پەنجەی دەست دەژمێردران. بیرم بێ کوڕێک هەبوو کوێریش بوو، کەمانی لێدەدا، ناوی (عەزیز عەرزا وردە) بوو، جا ئەوەشت پێبڵێم، ئەوسا گۆرانیوتن زۆر عەیب بوو، ئەوەی گۆرانی وتبا، پێیان دەگوت لۆتی!

– مامۆستا گیان! ئەوسا تۆ بەر ئەو تانە و تەشەرانە دەکەوتی؟
**کەریم کابان**: بەڵێ، زۆر جاریش، بەڵام من هیچم نەئەوت، وەڵامی کەسم نەئەدایەوە. سەد جار پێیان وتووم (لۆتی) ،چونکە گۆرانی دەڵێم، ئەوسا گۆرانی وەک ئێستا پیرۆز و بەنرخ نەبوو.

– مامۆستا ئێستا تۆ تەمەنت گەیشتووەتە (79) ساڵ، هیوا بە سەردەمی گەنجێتی دەخوازی؟ ئەی چی بە گەنجەکانی ئێستا دەڵێی؟
**کەریم کابان**: من بە پێی کات و سەردەمی خۆم، گەنجییەتییەکی خۆشم بەسەر بردووە، ئەوسا ژیان بە سادە و ساکاریی دەڕۆیی، پەشیمان نیم لەو ژیانی گەنجێتییەی خۆم. ئێستاش خۆم بە گەنج دەزانم و زۆربەی هاوڕێکانیشم گەنجن. من کەی توانای گۆرانیم نەما، ئەوساکە هەست دەکەم پیربووم!

– زۆر جار گوێمان لە هونەرمەندە کۆنەکان دەبێ، گلەیی دەکەن و دەڵێن گەنجەکان هونەری کوردییان شێواندووە، تۆ لەم بارەوە ڕات چییە؟
**کەریم کابان**: زۆر غەڵەت دەکەن بە ڕاستی، هونەر زۆر پیرۆزە... بەڵام هەندێک لەو گەنجانەش شیعری وا هەڵدەبژێرن، لە هەموو شتێک دەچێ بەس لە شیعر ناچێ! یا هی وا گۆرانی دەڵێ، دەنگی زۆر ناخۆشە. ئەمەشیان کردووە بە کارێکی بازرگانی و کوڕە دەوڵەمەندێکە بە پارە و سامان بە ئارەزووی خۆی گۆرانییەک تۆمار دەکات و هونەرەکە دەشوێنێ، ئەگەر نا، لەولاشەوە هونەرمەندی گەنجی بەتواناشمان زۆرە.

– مامۆستا، هەست ناکەی کەناڵەکانی ڕاگەیاندنیش پاڵپشتیی ئەم جۆرە کارانەن؟
**کەریم کابان**: با، ڕاگەیاندنەکان هیچ حساب بۆ بەرهەمی چاک و خراپ ناکەن، هەرچی بێتە بەردەمیان، دەیخەنە سەر شاشە، ئەوانیش بەشێک لە تاوانەکەیان بەردەکەوێ، هەموو ڕادیۆ و تەلەفیزیۆنەکان پێویستە لیژنەی تایبەتی خۆیان هەبێ بۆ هەڵبژاردنی کاری باش و خراپ.

– مامۆستا کەریم، بیرەوەریت لەگەڵ گۆرانیی (یاران وەسیەتم) چییە؟
**کەریم کابان**: من بیرەوەریی عاشقانەم نییە، چونکە ئەوسا ژن و منداڵم هەبوو.
من بە وەسفی وەسیەتنامەکەی (وەلی دیوانە) شەیدا بووم، بۆیە ئەو شیعرەم هەڵبژارد و ئاوازم بۆ دانا... پێش ئەوەش ئاوازم بۆ شیعری (لە درزی پەچەوە) واتە (جادە چۆڵ و سێبەر بوو) دانا، بەڵام بە ڕەحمەت بێ شەهید (قادر کابان)ی برام حەزی کرد بیڵێت، ئەوە بوو لە تەلەفزیۆنی کەرکووک بە ڕەشوسپی تۆماری کرد. بە ڕەحمەت بێ ئاوازم بۆ مامۆستای خۆشەویستمان (عوسمان عەلی)ش داناوە.

– مامۆستا لەگەڵ شەهید (قادر کابان)ی هونەرمەند و برات هاوکاریی هونەریی یەکترتان دەکرد؟
**کەریم کابان**: هەردەم بەیەکەوە کارمان دەکرد و ئاڵوگۆڕی بیری یەکتریمان دەکرد، کاتێک ئەو یان من ئاوازێکمان دادەنا، پرسوڕامان بە یەکتر دەکرد، یان لە هەڵبژاردنی شیعرەکان هەمیشە بەیەکەوە

کارمان دەکرد.

– بۆ یادی ئەم هونەرمەندە بەڕێزەی برات، لەو ماوەیەدا دەنگوباسی ئەوە هەبوو، گوایە گۆڕەکەتان دۆزیووەتەوە، شتی وا هەیە؟
**کەریم کابان**: دوای پرۆسەی ئازادی (وەفاتنامە) کەمان دۆزییەوە لە بەغدا، بەڵام خۆتان دەزانن لەسەر هەموو وەفاتنامەیەک ژمارەی گۆڕ و شوێنەکە دەنووسرێ، کەچی لە بەختی ئێمە وەفاتنامەی شەهید قادر نە ژمارە و نە شوێنی لێنووسرابوو. (23) ساڵیشی بەسەر چووبوو.

– یادگاریت لەگەڵ حەمە ساڵح دیلان؟
**کەریم کابان**: لەگەڵ حەمە ساڵح دیلاندا زۆر هاوڕێ بووین، بەڵام ئەوسا من نزیکەی چواردەساڵ لە خوارووی عێراق دەژیام، لەگەڵ ئەوەشدا دانیشتمان زۆر بووە بەیەکەوە، زۆر هۆگری دەنگیشی بووم. ئێستاش حەز دەکەم گوێ لە گۆرانییەکانی بگرم.

– مامۆستا حکومەتی هەرێم و لایەنی پەیوەندیدار تا چەند ئێوەی هونەرمەندانی بەسەر کردووەتەوە؟
**کەریم کابان**: بەرامبەر بە هونەرمەندان کاریان کردووە، مووچەی ڕێزلێنانیان بۆ داناوین، زەوییەک و ئۆتومبێلێکم وەرگرتووە، بەڵام بێخانووم، ئەگەر حکومەت خانوویەکم بۆ دابین بکا، شتی چاکە.

– مامۆستا ڕۆژانە لەبەر خۆتەوە گلەیی لە سیستەمی ناو بازاڕ و هاتوچۆ و ڕێگاوبان و نرخی شتومەکەکان دەکەیت، ئەمە بۆچی؟
**کەریم کابان**: بەڵێ قوربان، ئەوەندە گلەییم هەیە نەبڕێتەوە، نە ڕێگە هەیە بڕۆی، نەدەتوانی پیاسەیەک یان بە کارێکی زەروریش بە ناو بازاڕدا بڕۆی. سیمای شار تێک چووە، با حکومەت ئەم دیاردەیە نەهێڵێ، چونکە دیاردەی مەدەنیەت لە شاری سلێمانیدا نەماوە، نازانی چۆن بڕۆی بەڕێوە!

– حەز بەدەنگی کێ دەکەی؟
**کەریم کابان**: من زۆر حەز لە دەنگی مامۆستا دیلان، ماملێ، حەسەن زیرەک، حەسەن گەرمیانی دەکەم، لە گەنجەکانیش گوێ لە بەهجەت یەحیا دەگرم، زەکەریاش گۆرانی (بگەڕێوە)ی زۆر خۆشە و کارم تێدەکات.

– هیچ جارێک دیار گۆرانییەکی خۆتەوە گریاوی؟
**کەریم کابان**: بەڵێ زۆر جاریش، بۆ نموونە لە شاری (سنە) لە هۆڵی (شەیدا) گۆرانیم ئەوت، بینیم لە خوارەوە خەڵک دەگرین، منیش قوڕگم پڕ بوو لە گریان. هەستم کرد ئەو خەلکە کە بەشێکن لە خۆم. ئەوان چەند پەرۆشی ئێمەن و چەند ئێمەیان خۆش دەوێ و ڕێز لە هونەر دەگرن.

– زۆر سوپاس بۆ ئەو دەرفەتەی پێت داین، هیلاکمان کردی بە ڕاستی!
**کەریم کابان**: بە پێچەوانەوە، من زۆر خۆشحاڵ بووم!

# لەبارەی کەریم کابانەوە

**زانا مەحموود هەژار**

پێش ئەوەی پێنووس بخەمە سەر خامە و بۆ کەریم کابان و چەند دێڕێک بنووسم، خەیاڵ بردمی بۆ ساڵانێک پێش لەدایکبوونم.

ئەو سەردەمانەی گوند لە جێی خۆی و شار پۆشتە بوو. گوند پڕە لە هونەر... لە شایی و شەوانی بەزمی چەپڵە و بەستە و حەیران و لاوکی ناو دیوەخانەکان. شاریش بە بۆنەی نەورۆزی پیرەمێرد و دیوەخان و ماڵانیش پڕن لە دەنگی ڕەشۆڵ و تایەر تۆفیق و حەمەساڵح دیلان.. ئەمان بە شیعر و مۆسیقا ژیانیان ئەبەخشییەوە بە مرۆڤەکان.

خەیاڵ بردمیەوە بۆ ڕیتم و ئاوازەکانی ژیانی منالّی، ئای کە جوان بوو ئاسمانی شار بە کۆلارەی ڕەنگاوڕەنگ ئەدرەوشایەوە، ئەی کە لە یاریی بەردەرگا ئەگەڕایتەوە، ئەی دەنگی پەڕەسێلکە مەست بە بۆنی ئاوڕشێنی بەردەرگای ماڵان. ئەی بەخەبەربوونەوە لە نیوەشەوی خەوی سەربان

به دەنگە خۆشەکەی (مەلا حەسەن) لە شەوانی ڕەمەزاندا. ئەی چەپڵە و ڕیتمی فیکلانکۆ و یارییە کچانەکانی بەردەرگا. ئەمانە و ئەمانە یادەوەرییە جوانەکانی منالێن.

که له قوتابخانه بووم، مامۆستای مۆسیقا هەڵیئەساندین. من و چەند هاوڕێیەکم بە ڕیز لە پۆلدا گۆرانیی یاران وەسیەتمی کەریم کابانمان ئەوت. زۆر عەسرانیش لە دوکانە بچووکەکەی باوکم (مەحموود هەژار) لە جادەی مەولەوی سەرەتای بینینم بوو، کە بە هێمنی بە تەزبیحە دەنگ گەورەکەیەوە بە جادەی مەولەویدا تێئەپەڕی و لەبەر خۆیەوە بە چرپە و بە هێمنی گۆرانیی ئەوت، خۆشبەختانە کە لە مۆسیقادا گیرسامەوە، دوو بەرهەمم بۆ دروست کرد، یەکەمیان ئاوازی تەمەن لەگەڵ تیپی مۆزیکی سلێمانی، دووەمیان باوانم کە بەشێک لە ئاواز و ئامادەکردنەکەیم گرتە ئەستۆ.

هەروەها لە زۆر ئاهەنگ و فێستیڤاڵدا لەگەڵ تیپی مۆزیکی سلێمانی بەشدارییم لە بەشێک لە هزری کەریم کاباندا کردووە. لەم ساڵانەی پێشوودا هەستم کرد کەریم کابان چاکەت و پانتۆڵێکی سپی و جوانە لە بەری سلێمانیدا، بەڵام دوایی هەموو کورد کردییە بەری.

کەریم کابان و تیپی مۆزیکی سلێمانی ئەو ئاواز و مۆسیقایانەی کە بۆ دەنگی ئەو هونەرمەندەیان دروست کرد، ئەوانە هەمووی بەشێکن لە جوانی و داهێنانەکانی چل ساڵی پێشووی سلێمانی و کورد. لەبەر ئەوەی دەنگی کاک کەریم زۆر پاک و سازگار و زۆر تایبەتە و هۆنراوەی جوانی هەڵبژاردووە بۆ زۆربەی گۆرانییەکانی. لە تیپی مۆسیقای سلێمانی ئامادەکردنی جوانی بۆ کراوە و ئاوازەکانی زۆر ڕۆمانسین. ئەمانە وای کردووە کە زۆربەی کورد میلۆدییەک یان چەند میلۆدییەکی کاک کەریمیان لەبەرە، تەنانەت زۆربەی مۆسیقاکەشیان لەبەرە.

کاک کەریم بێجگە لەوەی کە گۆرانیبێژێکی زۆر تایبەتە ئاوازدانەر و شیعردۆستیشە، کەسێکی زۆر کۆمەڵایەتییە و لەگەڵ خۆشی و ناخۆشیی خەڵکدا بووە. ئەتوانیت لە ناوەڕۆکی ئاوازەکانی کەریم کابانەوە نیشتمانپەروەری و خاکپەروەری و جوانناسی و ڕۆحانیەتی ئەو پیاوە دەستنیشان بکەین.

لە کۆتایدا ئەڵێم کاک کەریم گۆرانیبێژی سەدەیە و سەدان ساڵی تر ئەو ئاوازانە لە بیر ناچنەوە.

# فۆرمی موزیک له میلۆدییەکانی کاباندا

زۆزك قەرەداغی

هەمووان بێگومانین لەوەی کە هەر لە سەرەتای دروستبوونی مرۆڤ و سەرهەڵدانی کولتووری نەتەوایەتی بۆ پێشخستنی نەتەوە و وڵاتێک ئامانجی خۆڕسک و ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی کەسایەتییە بەتواناکانی نێو نەتەوەکە بوون، هەر داهێنان و هەوڵ و ئەفراندنی ئەوان بووە دواتر تیۆری زانستی و ئەکادیمی لە سەرجەم بوارە جیاوازەکانی ژیانی لێخوڵقاوە، بەڵام گرنگ ئەوە بووە هەر لە سەردەمە سەرەتاییەکانی دەستپێکی ژیانی سەر زەوییەوە مرۆڤەکان پا بە پای داهێنان هەوڵێکی زۆریشیان داوە بۆ پاراستنی کولتوورە جیاوازەکانیان بۆ دوو مەبەستی گرنگ:

یەکەمیان/ لەپێناو مانەوەی هەوڵ و داهێنانەکانی پێشتر. دووهەمیشیان/ لەپێناو پشتئەستوربوونی نەوەی نوێ بۆ گەیشتن بە خاڵ و داهێنانی گەورە و بنچینەیی دیکە. بە داخەوە، لە نێو میللەتی کورددا ئەم دوو خاڵە زۆر بە لاوازی لە کۆنەوە تا ئێستا دەگوزەرێت، ئەگەرچی مێژووی هونەریمان لە بواری موزیک و گۆرانیدا زۆر کەمە، یاخود هەوڵێک نەزانراوە بۆ پاراستنی زۆرینەی، لەم ڕوانگەیەدا هونەری گۆرانیوتن زیانێکی گەورەی پێگەیشتووە، چون گۆرانیبێژان نەیانزانیووە سوود لە چ شێواز و ڕێڕەوێک وەرگرن بۆ هۆنینەوەی بەهرەکانیان لە کایەی گۆرانیچڕیندا.

بەم پێیە، گۆرانیبێژانی سەدەی بیستەمی کوردستان گرنگی و بایەخی کولتووریی زۆر گەورەیان هەیە، ئەگەرچی تۆماری دەنگیان یاخود شێوەی جێبەجێکردن و بڵاوکرنەوەیان بە جۆرێکی باش یان ئەوتۆ نەبووە، بەڵام ئەکرێت ببنە سەرچاوەی یەکەمی زانستی ئەکادیمیی شێوازەکانی گۆرانیی کوردی.

هونەرمەندی مەزن مامۆستا کەریم کابان یەکێکە لەو سیمبولە دیار و داهێنەرانەی کە ئەگەرچی پەیوەست نەبووە بە مۆرک و شێوەی گۆرانیچڕینی گۆرانیبێژە بەناوبانگە کوردییەکانی پێش خۆی، توانیویەتی بە شێوەیەکی خۆڕسک ڕۆبچێتە نێو مۆرک و میلۆدیی کوردیی تایبەت بە گەرووی خۆی.

مامۆستا کابان لە ڕووی زانستی موزیک و گۆرانییەوە دەچێتە ڕیزی داهێنەرانی گۆرانیی ڕۆمانسی کوردی بە دەنگی پیاوان، ئەگەرچی پەیژەی موزیکی ڕۆژهەڵاتیی بەکار هێناوە، بەڵام توانیویەتی لە نێو میلۆدییەکانیدا سوودێکی باش لە پەیژە زانستییەکانی موزیکی جیهانی ببینێت لە پەیژەی (گەورە و بچووک) کە دوو پەیژەی سەرەکین لە نێو ئاوازەکانی موزیک و گۆرانیی سەرجەم جیهان.

جوانترین خەسڵەتێک لە شێوەی کارکردنیدا پێچەوانەی زۆرینەی گۆرانیبێژانی دیکە بووە و هەرگیز ئارەزووی ئەوەی نەکردووە، کە بە ژمارە گۆرانی تۆمار بکات، بەڵکو هەمیشە هەوڵی داوە جۆری گۆرانییەکە باش بێت و بەو چەشنە بخولقێ، کە بچێتە سەر زاری سەرجەم کوردستانییەک، ئەمە جگە لەوەی توانیویتی ئەو میلۆدییانەی میانە باو و دووبارەکانی گۆرانیی کوردی تێپەڕێنێت و لەجیاتیی دوو یان سێ یا چوار دەنگ، چووەتە هەشت دەنگەوە، واتا پەیژەیەکی تەواوەتی. لێرەدا جێی ئاماژەیە ئەوەمان لە بیر نەچێت مەرج نییە گۆرانیبێژی باش و بەتوانا بریتی بێت لەوانەی کە زۆر بە بەرزی دەتوانن گۆرانی بچڕن، بەڵکو ئەمە خەسڵەتێکە لە مرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤێکی دیکە جیاوازە، لە هەمان کاتدا هەندێکی دیکە ناتوانن بە دەنگە گرەکان گۆرانی بچڕن، لێرەدا چۆنێتیی گوتن و هۆنینەوەی ڕستە و هەناسەدان دەبێتە پێودانگی سەرەکیی گۆرانیچڕین. لەم ڕوانگەیەوە مامۆستا کەریم توانیویێتی بە دەنگی گڕ ئەو هەست و سۆزە ڕۆمانسییانەی نێو ئاواز و هۆنراوەی گۆرانییەکان لێوانلێو بگەیەنێتە ئاستی جوان و باڵا، وەک لە پێشتریشدا ئاماژەم پێدا، کابان ڕێچکەیەکی پێشینە نەبووە وەک قوتابخانەیەکی گۆرانیگوتن، تا بزانێت چۆن دەست پێبکات، کە ئەمە لە موزیک و گۆرانیی ئەکادیمی جیهانیدا خاڵێکی زۆر گەورە و داهێنەرانەیە، بگرە تا ڕادەیەک ئاستەمە، چون کاتێک هونەرمەندی ئەڵمانی خۆی وەک داهێنەر نیشان داوە، پشتئەستوور بووە بە ژمارەیەکی زۆر موزیکدانەری پێش خۆی لە نێو سەدەی کلاسیک و سەدەکانی پێشتر لە (ڕێنیسانس یان بارووک). بۆیە بێتهۆڤن زانیویێتی چی بکات گرنگە، یان چۆن هەوڵەکانی ئەوان بەرەو داهێنانی زیاتر بەرێت، پاشان شۆبێرت دروست بووە، دواتر چایکۆڤسکی هەموو ئەو پێینانەی لە بەردەستدا بووە. لێرەدا مامۆستا کەریم کابان تەنها لە ڕێگەی ڕادیۆی هەندێک چایخانە، گەر ئەویش هەبوویێت، گوێبیستی هونەرمەندانی نەمر (عەلی

مەردان، سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی، دایکی جەمال، عایشە شان، حەسەن زیرەک و...) بووە، بەڵام زۆر بە وریاییەوە هەوڵی شێوازێکی تایبەتی داوە. هەر لە کۆنەوە مەقاماتی نەوتووە وەک ئەوەی ئەو کەڵە گۆرانیبێژانە ئەو کەلێنەیان پڕ کردووەتەوە، یاخود بەو جۆرە بیری لێکردووەتەوە، کە پێویست ناکات من مەقامێک بڵێم وەک ئەوان دووبارە بێت، یاخود وەک ئەوانی دی باش و بە دڵی خۆم نەیچڕم، هەڵبەتە جوانترین سیفەتی هونەریی مامۆستا کابان لەوەدا بووە، کە بە مەرجی نەزانیووە خودی خۆی سەرجەم ئاوازەکانی خۆی بڵێت، بە تایبەت ئەگەر زانیبێتی بۆ دەنگی کەسێکی تر خۆش و شیاوترە، ڕاستگۆیانە و بەوپەڕی بەرپرسیاریەتیی هونەرییەوە ئاوازەکانی پێشکەش کردوون، یەکێک لە دیارترین نموونەی زیندوو گۆرانی بەناوبانگی (جادە چۆڵ و سێبەر بوو)، کە ئاوازی خۆیەتی و داوێتی بە هونەرمەندی نەمری برای، مامۆستا قادر کابان. ئەگەر ئەو بەرپرسیارێتییە لای زۆرینەی گۆرانیبێژ و موزیسیانانی کورد چەکەرە بکات، زۆر زیاتر موزیک و گۆرانیی کوردی بەرەو پێش دەچێت.

خۆشبەختانە، میلۆدیی گۆرانییەکانی مامۆستا کەریم لە ڕووی فۆرمی زاستی موزیکەوە زۆر گونجاوە بۆ بەکاربردنی لە فۆرمە زانستی و جیهانییە باوەکانی وەک (سۆناتە، کۆنسێرتۆ، سویت، سیمفۆنی و...). بەندە ڕیزبەندێکم لە موزیکی کوردی لە شەش پارچەدا ڕشتووە، خوایار بێت، دەیخەمە نێو فێستیڤاڵێکی نێودەوڵەتییەوە. هەر پارچەیەی تایبەتە بە ناوچە و مۆرکێکی کوردی، بەبێ ویستی خۆم بۆ میلۆدییەکی جوان کە بتوانرێت بە فۆمی موزیکی کلاسیک یان ئۆرکێسترا کاری لەسەر بکرێت، پەلکێش بووم بۆ میلۆدی کابان و گۆرانیی (نامەیەک بۆ خاتووزین) م بەکار هێناوە، کە زۆر گونجاوە بۆ بەکارهێنانی ڕێسا زانستییەکانی ئۆرکێستراسیۆن. ئەکرێت میلۆدییەکانی بە شێوازی هەمەچەشنە وەک موزیکی بەبێ وشە سوودی لێ وەربگیرێت و داهێنانی لەسەر ئەنجام بدرێت، گرنگە وەزارەتی ڕۆشنبیری ساڵانە بەرهەمە تۆمارکراوەکانی مامۆستا کەریم کابان و زۆرینەی گۆرانیبێژانی کوردی خاوەن ڕێچکە دووبارە بە بەرگ و زانیاریی زانستییەوە بڵاو بکەنەوە لەپێناو ئەوەی هەمیشە ئەو بەرهەمانە لە بەردەستدا بن، وەک نموونەیەکی زیندوو و ڕێچکەی سەرەتای گۆرانیی کوردی ناوچە جیاوازەکانی کوردستانی گەورە.

# ماموٚستا کەریم کابان
# دەنگێکی هەمیشە زیندوو

**نوسینی : بەهجەت یەحیا**

زۆر کەس گۆرانی دەڵێن، بەڵام کەمن ئەو دەنگانەی کە لە دەرگای دڵمان ئەدەن و بە ناخی ڕۆحماندا ڕۆئەچن، کەم دەنگ هەیە ببێتە هاوڕێمان و یادگارییەکانمان بهەژێنێ. گۆرانیی زۆر هەن، بەڵام ئەو گۆرانییانەی کە دەبنە ناسنامەی نەتەوەیەک، کەم و دەگمەنن، دەنگی ماموٚستا کەریم کابان یەکێکە لەو دەنگانەی کە لێوانلێوە لە ڕۆمانسیەت، وەک دارسنەوبەرەکانی گۆیژە چاروەرزە سەوز و هەمیشە گەنجە. کاتێک کەسێک گوێبیستی گۆرانیی (قەت نەدەی ئازاری گیانی مەست و بێدارانی شەو) دەبێت، لە دەربڕینی هەستی گەرمیدا هەست بە

هەموو ئەو ئازارانە دەکات، کە لەپێناوی ئەویندا بەر مرۆڤەکانی ئەم کۆمەڵگەیە کەوتوون، گۆرانیی (یاران وەسیەتم) دنیایەک میهر و وەفامان نیشان دەدات. (گیانە لە پرخەی خەوی خاوما، پێبنێ وەبان هەردوو چاوما) وانەیەکە لە خۆشەویستی و لەخۆبوردن و قوربانیدان. لە ناو کۆی گشتیی تابلۆی گۆرانییەکانیدا (هەیکەلی عومرێکی حەسرەتکێش) بەدی دەکەین، هەر وەک شاعیری گەورەی کورد گۆران بۆ دەرویش عەبدوڵڵای نووسیووە (لە سیماتا بەدیم کرد هەیکەلی عومرێکی حەسرەتکێش... وەها دیارە کە بەختت ئاشیانی بولبولی خەم بێ).

مامۆستا بەهرەی ئاوازدانانی هەیە و بەرهەمە سەرکەوتووەکانی کە ئاستێکی هونەریی بەرزیان هەیە، ئاوازی خۆین، ئاوازەکانی تایبەتمەندییەکی تەواویان هەیە بە دەنگ و سەدای خۆیەوە و بوون بە قوتابخانەیەکی تایبەت بە خۆی، بێجگە لەوەش، وەک لایەنی تەکنیکیی ئاوازدانان هەست ئەکەین مامۆستا شارەزاییەکی تەواوی بەکار هێناوە، بۆ نموونە، گۆشەی یەکەمی ئاوازەکانی لە تیتراکۆردی یەکەمی مەقامەکاندایە و گۆشەی دووەمی ئاوازەکان لە تیتراکۆردی دووەمی مەقامەکاندایە، مانای هەموو دەنگەکانی پەیژەی مۆسیقاکەی بەکار هێناوە، کە ئەکاتە هەشت دەنگ، چونکە زۆر جار گوێمان لە گۆرانی دەبێت، کە لە دوو تا سێ تۆن یان ئەوپەڕی چوار تۆن تێپەڕ ناکات، بەڵام مامۆستا ئەو ڕێچکەیەی شکاندووە و هاتووە زۆر بە شێوازێکی جیاوازتر و مۆدێرنتر ئاوازی زۆر جوان و ڕەسەنی بەخشیووە بە هونەری کوردی، سەبارەت بە هۆنراوەی گۆرانییەکانی، هەستێکی زۆر جوان و ناسک بەدی ئەکەین و سەلیقەیەکی گەورە لە هەڵبژاردنی هۆنراوەدا، ئەگەر زۆر بە وردی گوێ لە گۆرانییەکانی مامۆستا بگرین، هەست ئەکەین کە تەنها ئەو هۆنراوانەی وتووە، کە زۆر دانسقەن، و پڕمانان و پەیامێکی مرۆڤدۆستانەی پڕ لە خۆشەویستییان لە ئامێز گرتووە، بێجگە لە هەموو ئەو جوانییانەی کە باسمان کرد، شایەنی باسە کە جاران ئەو کەسانەی کە لەو سەردەمەدا لە بواری هونەریدا کاریان دەکرد، گرفتی کۆمەڵایەتیی گەورەیان بۆ دروست دەبوو، ئەو سەردەمە هەروا ئاسان نەبووە کەسێک بە ئامێرێکی مۆسیقاوە بە کوچە و کۆڵانێکدا گوزەر بکات، یان کەسێک گۆرانیی بگوتایە، هێشتا هونەر لە کۆمەڵگەی ئێمەدا پێی خۆی بە تەواوەتی دانەکوتابوو، نە لە بواری شانۆ و نە لە بواری نیگارکێشی و نە لە بواری مۆسیقادا، کارکردن لە بواری هونەریدا بۆ خۆی شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی بوو. مامۆستا کەریم کابان سەرەڕای بەخششی گەورەی بە ئەرشیفی هونەری کوردی، وەک مرۆڤ هەتا بڵێی کەسێکی خاکی و سادەیە، کە ئەوەش جوانترین ئاکارە.

# گفتوگۆ لەگەڵ
# کەریم کابان

**سازدانی: ئارام سدیق**

کەریم عەبدولکەریم جەلال مەحمود ناسراو بە کەریم کابان و لە ساڵی 1927 لە گەڕەکی مەڵکەندیی شاری سلێمانی هاتووەتە دنیاوە. هەر لە منداڵییەوە عەشقی هونەر و مۆسیقا بووە و تا دواجار لە ڕێی خوێندنگەوە ئاوێتەی دنیای گۆرانی و مۆسیقا بووە. ئێستا خاوەنی چەندین کاسێتی ناوازەیە و زیاتر لە نیوسەدەیە خزمەتی گۆرانی و مۆسیقای ڕەسەنی کوردی دەکات و تا هەنووکەش لەگەڵ کاروانی گۆرانی و مۆسیقای ڕەسەنی کوردیدا ڕێ دەکات و بە عەشقێکی گەلێ مەزنەوە ڕۆحی ئاوێتەی هونەر بووە.

*** چۆن سەرەتای کاری هونەریت دەست پێکرد؟**

– سەرەتای ئاشنابوونم بە هونەر لە ساڵی چلەکانەوە دەست پێدەکات، کاتێک لە قوتابخانە لە تیپی سروود بووم، پاشان ڕادیۆیەکی ناوخۆیی هەبوو بۆ گەیاندنی دەنگوباسی جەنگی جیهانی دووەم

بە خەڵکی سلێمانی، من لەو ڕادیۆ ناوخۆییەدا گۆرانیم دەوت. ئەو کاتە مۆسیقا نەبوو، بەبێ مۆسیقا بەرهەمەکانمان پێشکەش دەکرد. دواتر لە ساڵی 1945 چووم بۆ بەغدا لە دەورەی لاسلکی پۆلیسی وەرگیرام. لە 1/7/1945 بۆ یەکەم جار لە ڕادیۆی بەغدا دانرام و ڕۆژانی هەینی ڕاستەوخۆ بۆ ماوەی نیوکاتژمێر گۆرانیم پێشکەش دەکرد، پێویستە ئەوەش بڵێم لەو سەردەمەدا تۆمارکردن نەبوو. یەکەم گۆرانیشم لەوێ بڵاو کردەوە، کە گۆرانی (ئەمبەرەوبەرە) بوو. دوای چەند ساڵێک لە ڕادیۆی بەغدا مامەوە و چەند هونەرمەندێک لەگەڵمدا بوون، وەکو مامۆستایان (عەلی مەردان، حەسەن جەزراوی، ئەڵماس محەمەد، فەوزیە محەمەد، تایەر تۆفیق، ڕەسوڵ گەردی، نەسرین شیروان)، هەروەها دوابەدوای ئەوەش لەوێ دوور کەوتمەوە و لە ڕادیۆ تا ساڵی 1954 چوومەوە بۆ ڕادیۆ، پەیوەندیم بە (کامیلی کاک ئەمین)ەوە کرد، کە لە ساڵانی چلەکانەوە لەوێ بوو و زۆر هاوکاریی هونەرمەندانی دەکرد. لەوێ توانیم کاسێتێک تۆمار بکەم. یەکەم گۆرانی کە تۆمارم کرد، گۆرانی (لە ڕێی دڵداریا)بوو، کە هۆنراوەی شێخ ئەحمەدی شێخ غەنی و لە ئاوازی خۆم بوو. گۆرانییەکانی ئەو کاسێتەش ئەمانە بوون: (لە ڕێی دڵداریا، خۆزگەم بە پار، ئاواتی دووری) و پێنج گۆرانیی فۆلکلۆریی تر.

*** باسی هونەرمەندان (تایەر تۆفیق و عەلی مەردان و... هتد) کرد. لەو کاتەدا هاوکاریی یەکترتان نەکردووە، یان پێکەوە گۆرانیتان نەوتووە؟**

- نەخێر، هیچ هاوکارییەکی ئەوتۆ نەبوو، بەڵام هونەرمەندان (شەماڵ صائب، نەسرین شیروان، ڕەسوڵ گەردی و چەند هونەرمەندێکی تر کە ناوەکانیانم بیر نەماون) ئەمانە گۆرانییەکانیان بۆ دەسەندمەوە، واتە وەکو کۆرس هاوکارییان دەکردم. تا ئێستاش لە گۆرانییە فۆلکلۆرییەکانمدا دەنگیان دیارە، هەروەها لەگەڵ هونەرمەندان (تایەر تۆفیق و عەلی مەردان...)دا ئەوەمان بۆ ڕێک نەکەوت، کە پێکەوە گۆرانی بڵێین، چونکە هەر هونەرمەندە و ڕۆژێکی تایبەتی بۆ پێشکەشکردنی گۆرانییەکانی هەبوو.

*** واتا پێکەوە گۆرانیتان نییە و هاوکارییش لە نێوانتاندا نەبووە؟**

- نەخێر، وەکو وتم، بۆمان ڕێک نەدەکەوت، بەڵام لەگەڵ هونەرمەند عوسمان صابونچی، کە هونەرمەندێکی خەڵکی سلێمانی بووە و لە ساڵی حەفتاکاندا کۆچی دوایی کرد، لەگەڵ ئەو پێکەوە گۆرانیمان وتووە.

*** لە سەرەتادا وتت یەکەم گۆرانیم گۆرانی (لە ڕێی دڵداریا) بوو، ئایا دڵداریت کردووە؟**

- بڕوا ناکەم هەموو کەس دڵداری نەکردبێ، من یەکەم دڵداریم ئەوە بوو، کە لە بەغداوە چوومە سیدەکان. لەوێ ژنێکم هێنا و چوار پێنج ساڵ پێکەوە بووین، بەڵام نەگونجاین و جیا بووینەوە، ئەوە یەکەم دڵداریم بووە.

***ئەی هاوسەرەکەی ئێستات بە دڵداری هێناوە یان ڕێکەوت بوو؟**

- نەخێر بە دڵداری نەمهێناوە. هاوسەرەکەم کچی خاڵمە و هیچ خۆشەویستییەک لە نێوانماندا نەبووە پێش زەواج، بەڵام ئێستا یەکتریمان زۆر خۆش دەوێت.

*** زۆر جار بیستوومە دەڵێن دڵت تەڕە، دڵێکی گەنجانەت هەیە، ئەمە تاچەند ڕاستە؟**

- هونەرمەند ئەگەر هەستێکی ناسک لە خۆیدا شک نەبات و خاوەنی دڵێکی گەنجانە نەبێت، ناتوانێ درێژە بە هونەر بدات. من شەیدای گۆرانی و مۆسیقای کوردیم و گۆرانیی کوردی ئاوێتەی ڕۆحم بووە.

*** ئەو پاڵنەرانە چی بوون، کە وایان لە جەنابت کرد پەنا بۆ هونەری گۆرانی ببەی؟**

– لەقوتابخانە هەرچیمان دەوت، سروودی نیشتمانی بوو. هەر ئەو سروودانەش عەشقی نیشتمانی لە دڵمدا چەسپاند، بەڵام پاش ئەوە کە چوومە ڕادیۆ، ئاشنای گۆرانیی دڵداری و سۆزداری بووم. ئیتر سۆزی نیشتمانی یان دڵداری، یان سروشتی کوردستان یان ڕزگاربوونی میللەتی کورد و کوردستانی گەورە و یان سۆزی تەصەوفی... ئەمانە هەموویان پاڵنەرم بوون، من گۆرانی بۆ خۆم ناڵێم، هونەر بۆ گەلە نەک بۆ هونەرمەند خۆی، دەبێ هونەرمەند کە گۆرانی بۆ خەڵک دەڵێ، دەبێ گۆرانییەکەی چەشنێک بێت، کە چێژ بە خەڵک ببەخشێت.

*** لە زۆر لە هونەمەندانم بیستووە، کە بە ڕێدا دەڕۆن، گۆرانی دەڵێن. جەنابت کە بە ڕێدا دەڕۆی، چ گۆرانییەک دەڵێیت؟**

– من بەڕێوە گۆرانی ناڵێم، چونکە لە وڵاتی ئێمەدا خەڵک بە عەیبەی دەزانێ، بەڵام لە مێشکی خۆمدا شتێک هەر هەیە، دەنا گۆرانیوتن بە ڕێگاوە عەیب نییە و ئاساییە.

*** سەرەتای دۆزینەوەی ڕێچکەیەکی تایبەت بە خۆت کەی دەستی پێکرد و تایبەتمەندییەکانی ئەو ڕێچکەیەت چین؟**

– هەر لە سەرەتاوە کە زانیم دەنگم خۆشە و بەهرەی دەنگخۆشیم لە خۆمدا بینییەوە، ڕێچکەیەکی تایبەتیم بۆ خۆم دەستنیشان کرد و بوومە خاوەن ڕێچکەیەکی تایبەتی خۆم، تایبەتمەندییەکانی ئەو ڕێچکەیەشم ئەوەیە، کە مۆرکێکی ڕەسەن لە دەنگمدا هەیە، کە تایبەتە بە دەنگی من. هەر ئەوەشە کە دەنگی من لە دەنگی هونەرمەند (حەمەجەزا) یان یەکێکی تر جیا دەکاتەوە یان بە پێچەوانەوە.

*** لەگەڵ گەشەسەندنی قۆناغە هونەرییەکاندا بە کام هونەرمەند کاریگەر بوویت و چ کاریگەرییەکی لەسەر ژیانی هونەریت کردووە؟**

– هیچ هونەرمەندێک کاریگەریی نەبووە لەسەرم و سوودم لە هیچ گۆرانیبێژێک وەرنەگرتووە و نەشمویستووە وەکو هیچ گۆرانیبێژێک گۆرانی بڵێم، ویستومە وەکو کەریم کابان گۆرانی بڵێم. لەبەر ئەوەی دەنگم مۆرکێکی تایبەتی ڕەسەنی تێدایە، بۆیە نەچوومەتە سەر هیچ مۆرکێک، کە خاوەنی هەبووبێت، چونکە من لاساییکردنەوەم بە لاوە هونەر نییە.

*** ڕەسەنایەتیی مۆسیقا و گۆرانیی کوردی لە چیدا دەبینیتەوە؟**

– مۆسیقا و گۆرانیی کوردی لە ئێستادا لەبەر ئەو ئازادییەی پاش ڕاپەرین فەراهەم بووە لەناو خەڵکدا، ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی خەڵک زیاتر ڕوو لە گۆرانی و مۆسیقا بکات، کاتی بەعس کە گۆرانییەکت تۆمار دەکرد، دەبووایە بتناردایە بۆ کەرکوک لەوێ لیژنەی چاودێری بڕیاری بڵاوکردنەوەیان دەدا، بەڵام ئێستا ئەوە نەماوە. لیژنەی چاودێری نییە. هەرکەسە و هەڵدەسێ گۆرانی دەڵێ، بەمەش گۆرانی و مۆسیقای کوردی گەشەی کردووە.

*** بمبوورە، من مەبەستم ئەوەبوو توانیوومانە ڕەسەنایەتیی گۆرانی و مۆسیقای کوردی بپارێزین؟**

– سەبارەت بە پاراستنی ڕەسەنایەتیی گۆرانی و مۆسیقا، هێشتا زۆرمان ماوە، دەبێت ئێمە گۆرانییەکانمان لە ڕۆحیەتی فۆلکلۆرەوە سەرچاوە

بگرێت، پاشان ئاوازی تازە لە ڕۆحی فۆلکلۆرەوە دابنێین، بەڵام ئێمە هێشتا ماومانە ئەو ڕەسەنایەتیە بپارێزین، بە حوکمی ئەوەی شوێنی جوگرافیمان کە کەوتوینەتە نێوان (فارس، تورک، عەرەب) کە مۆرکی ئێمە تێکەڵ بە گۆرانیی ئەوان بووە و هی ئەوان تێکەڵ بە گۆرانی ئێمە بووە، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئێمە مۆرکەکەی خۆمان بپارێزین و پاک ڕای بگرین.

*** ئەو تایبەتمەندییانە چین، کە گۆرانی و مۆسیقای کوردی لە گۆرانی و مۆسیقای وڵاتانی تر جیا دەکاتەوە؟**

- هەموو میللەتێک ڕێچکەیەکی تایبەتی مۆسیقا و گۆرانیی خۆی هەیە، لە هەموو هونەرەکانی تریشدا بە هەمان شێوەیە، ئێمەش وەکو کورد، مۆرکی تایبەتی خۆمان هەیە. ئەگەر ئێمە لەسەر ئەو ڕێچکەیە بەردەوام بین و ڕێ بکەین، ئەوا وەکو هەموو میللەتانی تری جیهان دەتوانین بڵێین هەین.

*** سەردانی ئەم دواییەتان بۆ شاری سنەی کوردستانی ڕۆژهەڵات لەگەڵ هونەرمەندانی گۆرانیبێژ (حەمەجەزا، عەبدولقادر حەسەن) چۆن ڕێك خرا؟ ئەو سەردانە چۆن پێناسە دەکەیت؟ چ کاریگەرییەکی لەسەر ژیانی هونەریت هەبوو؟**

- ئێمە لە زستانی پار لە مانگی یەکدا لەگەڵ تیپی مۆسیقای سلێمانی دەستمان کرد بە خۆڕاهێنان. لە شاری سنەوە بانگێشت کراین، کە بچین هاوبەشی بکەین لە فێستیڤاڵی هونەری لە شاری سنە. ڕۆژی 14/2 لە ڕێی پێنجوێنەوە چووینە خاکی ئێران. کە گەیشتینە شاری سنە، پێشوازییەکی گەرممان لێکرا، ئێمە لەو بڕوایەدا نەبووین بەو جۆرە ئەو پێشوازییەمان لێبکرێت. من هەستم کرد کە ئەو میللەتە زۆر تینووی ئێمەن و تامەزرۆی گۆرانییەکانمانن، هەر بۆیە زۆر بە عەشقەوە داوای ئیمزایان لێدەکردین و وێنەیان لەگەڵ دەگرتین و ماچیان دەکردین. بە ڕاستی ئەو سەردانە نوێبوونەوەیەک بوو لە ژیانی هونەریی مندا و زۆر خۆشحاڵ بووم و حەزم دەکرد زۆر لایان بمێنمەوە، بەڵام دەرفەتمان تەنها پێنج ڕۆژ بوو.

*** وەکو هونەرمەندێکی بەئەزموون ڕات لەسەر هونەرمەندە لاوەکانمان چییە؟**

- هونەرمەندە لاوەکان تەنها دەیانەوێ گۆرانی بڵێن و گوێ نادەنە پاراستنی ڕەسەنایەتی، زۆر گۆرانیم گوێ لێیە هەست دەکەم عەرەبییە، یان فارسییە یان تورکییە، بەڵام تەنها هۆنراوەکە کوردییە، من لێرەدا داوا لەو هونەرمەندانە دەکەم، کە مۆرک و ڕەسەنایەتیی گۆرانیی کوردی بپارێزن.

*** کام لە هونەرمەندە لاوەکان توانیوویەتی ڕەسەنایەتیی گۆرانی و مۆسیقای کوردی بپارێزێت؟**

- ئەوەی کە زۆر توانیوویەتی ڕەسەنایەتیی گۆرانی و مۆسیقای کوردی بپارێزێت، وەک (عەدنان کەریم، بەهجەت یەحیا، خالید ڕەشید، مەحمود محەمەد، ئەرجومەن هەورامی، عادل هەورامی .... هتد) ئەمانە گۆرانییەکانیان مۆرکی ڕەسەنی پێوە دیارە و سۆزێکی زیندووی کوردانەی تێدایە.

*** بۆچی هەموو جارێك کە باسی هونەرمەندی دەنگخۆشی برات (قادر کابان) دەکرێت، جۆرە ماتییەك داتدەگرێت؟ چ یادگارییەك تۆی بە عیشقی ئەو هونەرمەندەوە بەستووەتەوە؟**

- ئەو هونەرمەندە گەورەیە برام بووە، پێکەوە ژیاوین، کە گەورەش بووین، هەر پێکەوە بووین و هەزاران یادگاریم لەگەڵیدا هەیە، کە هەرگیز بیرم ناچنەوە. بۆ 22 ساڵ دەچێت ڕژێمی بەعس گرتوویەتی و گومناوە، نە پێیان وتوین چییان لێکردووە و نە پێشمان دەڵێن. چەندین جار هەوڵمان داوە هەواڵی بزانین، بەڵام بێسوود بووە.

*** مامۆستا ئەگەر یادگارییەکی ژیانی هونەریتمان بۆ باس بکەی لەگەڵ هونەرمەند قادر کابانـدا..؟**

– یادگاریمان زۆر زۆرە، بەڵام یادگارییەکی هونەری ئەوەیە، کە من چەند ئاوازێکم بۆ ئەو داناوە وەکو لە درزی پەچەوە، کە بە (جادە چۆڵ و سێبەر بوو) ناسراوە، هەروەها کچی شۆخ و لە ڕێی دڵداریا کە من وتوومە و ئەویش وتویەتی، ئەمانە وام لێدەکەن کە هەرگیز لە بیرم نەچێتەوە، مەگەر مەرگ لە بیرم بباتەوە.

*** مامۆستا ئەنوەر قەرەداغی لە دیدارێکدا لە ژمارە (69)ی گۆڤاری ڕاماندا سەبارەت بە تۆ وتی: تا ئێستاش دەنگی هەر گەنجە. منیش لەگەڵ هەمان ڕادام. دەمەوێ بپرسم چی وای لە دەنگی جەنابت کردووە کە بە گەنجی بمێنێتەوە؟**

– ئەوەی ڕاستی بێت، جگەرەم نەکێشاوە، مەشروبی قورسم نەخواردووە تەنها مەگەر بیرە و شتی ئاسایی، هەروەها پارێزگاریی دەنگی خۆشمم کردووە، من سوپاسی کاک ئەنوەر قەرەداغی دەکەم، کاک ئەنوەر وەکو مانگی چواردە لە ئاسمانی هونەری کوردیدا دیارە، پێویستی بەوەصف کردن نیە.

*** تا چەند ئەندامانی خێزانەکەت هاوکارت بوون بۆ دنیای هونەر؟**

– تا ئێستا هاوکارییان نەکردووم، بەڵام هەندێ جار هانیان داوم بۆ ئەوەی گۆرانیی نوێ بڵێم. من ناتوانم وەکو هەندێ هونەرمەند ساڵی دوو کاسێت دەربکەم. دەمەوێ ساڵی یەک بەرهەم تۆمار بکەم و نرخی دە کاسێتی هەبێ و لە نێو گوێگرانمدا جێی خۆی بکاتەوە.

*** ئەی تۆ تا چەند هانت داون بۆ دنیای هونەر؟**

– من هیچ ڕێگر نەبووم کە ئیشی هونەری نەکەن، ئەوەش هاندانێکە.

*** هەست دەکەم گۆرانیی (تەمەن) لە هەستێکی زۆر پڕ لە سۆزەوە دێتە دەرێ. ئەم سۆزە گەرمە بۆ؟**

– من وا هەست دەکەم ئەو شیعرە بۆ من نووسراوە، باسی ژیان دەکات لە تەمەنی مندا، هەر ئەمەش وای لێکردم کە بە سۆزێکی گەرمەوە بیڵێم.

*** دوایین پرۆژەی هونەریت چییە؟**

– گۆرانییەکی نوێیە بە ناوی (خەزان)، کە لە هۆنراوەی ئەحمەد محەمەدە و بە نیازم لەم ماوەیەدا بیدەمە تیپی مۆسیقای سلێمانی تا ئاوازی بۆ دابنێن و پاشان بیکەمە گۆرانی.

***دواجار ئێمە هیچمان نییە. دواوتەی بەڕێزت چییە؟**

– ڕێزم بۆ هەموو هونەردۆستان و بە هیوای بەرەوپێشبردنی هونەری کوردی و سوپاسیش بۆ ئێوە.

کابان
زۆقادر

# بێدەنگ بن پەیکەرێک دەدوێ

حەکیم مەلا ساڵح

ئێوارەیەکی درەنگ گەشتمە پایتەختی ڕۆشنبیری و خۆر ڕمێکی مابوو بمانسپێرێ بە تاریکی. ئوتومبیلە نەگبەتەکەمان جگە لەوەی لە ڕێگا ماوەیەک پەکی کەوت، لە زاڵگەکەی بەرەتای شاریشدا زۆریان وەستانین، دیارە هەواڵ گەیەنرابوو کە لە هەموو کەسێ بپرسنەوە بە مەبەستی ئەوەی ئەگەر زورێتێکی ئەهریمەن بەرگی فریشتەی پۆشیووە بۆ ئەوەی نەناسرێتەوە و زرمەیەک لە بناگوێی شار هەڵسێنێ، باڵبەستی بکەن و پاش پشکنین و لێکۆڵینەوە وەک شتێکی بێزەون ئاودیوی جەهەنەمی بکەنەوە. ئەمانە هەموو بە جێی خۆی و مامەوە سەرخۆم، کە یەک چرکەم بە ساتێ لێدەڕۆشت بۆ ئەوەی لە شارە پڕ لە زەوق و شەوقەکەدا سۆمام بە دیتنی پەیکەرەکە پرشنگ بکاتە بەرات. بەڵام بە داخەوە، کات تێپەڕی و تاریکی پەلکێشی کردم بەرەو ماڵی هاوڕێیەکم.

شەوەکەی (لە پرخەی خەوی خاومدا) گوێم ڕادێراوە بۆ جۆرێ گۆرانیی جادووباز و سەراپام شەلاڵی کەیف و خەنین بووە. ئەو شەوە عەتراوییە کە (قەت ئازاری گیانی مەست و بێدارانی شەو)ی نەدەدا، زۆر بە خۆشی گەیاندمە (هەوارەبەرزەی) بەیانی. بەبێ ئەوەی هاوڕێکەم بەئاگا بێنمەوە، بە کورتەنامەیەک

ماڵاواییم لێکرد و تەکسییەک گەیاندمیە خزمەتی پەیکەرە مەزنەکە: بەوپەڕی تامەزرۆییەوە بەرامبەری ڕاوەستام، لەگەڵ سەرنجداندا دیتم گەرد و تۆز لەسەر هەندێ شوێنی لاڵوپاڵ لیی کەوتوون، بە چەند کلینسێک ڕام ماڵین، چونکە بە لامەوە گوناهی گەورەبوو جگە لە پرشنگی خۆر یا نمەی باران هیچ شتێکی دیکە شەستەی بەسەردا بکات. نەیدەناسیمەوە، بۆیە بە ئاستەم هاتە گۆ:

– لەکوێوە هاتوویی؟

* بەڕێز گیان لە هەڵەبجەوە.

– ئاااخ، هەڵەبجەی شەهید؟

* بەڵێ.

– فەرموو... چۆن گەیشتوویتەتە لای من؟

* بیستم خەڵکی ئەم شارە لەبالەب لە عوشرەتە ئەم کارە شایستەیان بە باڵا بڕیووی، بە پێویستم زانی زیارەتت بکەم.

– ئەی بۆ نەچووی بۆ لای خۆی؟

* دڵم نابات، چونکە تەمەن تەنگی پێ هەڵچنیووە و بە دیتنی ئازار ڕۆحم دەکرۆژێ، خەم گیانم دەکاتە کوانوویەکی گڕپەدار. بەڵام لای تۆ دەکەومە ژێر ڕێژنەی شادییەوە و دەڵێم ئۆخەی.

ئەو بێدەنگیی هەڵبژارد و منیش ڕامان ڕامان لە جێی خۆمدا وەستاوم و متەقم لێبڕاوە. بەڵام لە ناخەوە بێورتە ناڵە و نزوولەم دەگەییە تەشقی ئاسمان، چۆن...؟ ئاخر خەڵکی خوا ئێوە بڵێن چۆن هەناوم نەورووژێ بەرامبەر هونەرمەندێکی بەهرەمەند، کە بۆ خۆی لە جوگرافیای گۆرانیی کوردیدا لالەزارێکی لەسەر خۆی تاپۆ کردووە؟ چۆن؟ چۆن؟

هونەرمەندێک ئەگەرچی نەیتوانی لە (سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی) بەملاوە تا (بەهجەت یەحیا) مان لە بیر بەرێتەوە، بەڵام بووەتە وێستگەیەک و هەمووومانی لەسەر خۆی ڕاگرتووە. هونەرمەندێکی وا کە مێرگ و پۆرگ و دەنگ و سەنگی لە سەرجەم گۆرانیبێژەکانی دیکە جیاوازترە و بە یەک دەسکەگوڵی ستران چووەتە ڕیزی پێشەوەی بەهرەوەران.

چاوەکانی تریفەی سرەوتیان بە زایەڵەی دەروونم بەخشی. دەمودەست زانیم هەر ئێستە دەنگێکی نیانی خۆی ئاسایی لەسەر زاری باڵ دەگرێتەوە بۆ ناو هێلانە چکۆلەکەی ناخم.

– دەزانم پرسیارت لە دڵدایە... بۆ لیی وەستاوی؟

پاش کەمێ وەستان گوتم:

* گەورەم لەگەڵ ئەو سۆزەی کە لە دەنگتدا هەیە، شیعری بەزەوقیشت هەڵبژاردووە بۆ گۆرانییەکانت، ئەم دوو زەوقەت چۆن دەستەملانی یەک کردووە؟

گوڵاوی بزەیەکی بە ڕوومدا پژاند و گوتی:

– ئاشنایەتیم لەگەڵ شیعردا وەکو دڵی لاس وایە بۆ خەزاڵ، هەر ئەوەش هانی داوم کە شیعری زۆر بخوێنمەوە، کچۆڵەی ئەو شیعرانەی کە هەڵم بژاردوون، ناخیان هەژاندووم و مارەم بڕیوون لە ئاوازەکانم. دەنگی خۆش ئەگەر شیعری دڵگیری لەگەڵدا بێت، زیاتر گوێگر بەلای خۆیدا دێنێ، ئێمەیش وەکو کورد خەرمان بەرەکەت بەشی خۆمان شیعری لیریکیمان هەیە.

ئەم بۆچوونە تاوێک زمانی کردمە تەڵەی تەقیوو، واقم وڕما و یەک یەک شیعرەکان لە یادمدا کەوتنە سەما، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی هێنایەوە بیرم، کە یەک پیتی شیعرەکان لە بۆتەی ئاوازەکانیدا قووت نەدراون و نەرم نەرم دانیان پێدا دەنێ، بە پێچەوانەی هەندێ گۆرانیبێژی دیکەوە، کە جاروبار وشەکان تێک دەشکێنن بۆ ئەوەی پارسەنگی ئاوازەکەیانی پێ ڕابگرن.

پاش ئەو گەشتەی کەم تا زۆر خایەنە کە بە ناو گوڵشەنی شیعرەکانیدا کردم، ڕێگەم بە خۆمدا عەرزی بکەم:

* ئەی سەیدای هونەر و شەیدای شیعر بۆ ژمارەی گۆرانییەکانت زۆر نین؟

– ڕۆڵە گیان زۆر و کەم پێوانە نییە بۆ هونەر، گرنگ ئەوەیە هونەرت نواندبێ ئەگەر بە گۆرانی بێت یاخود بە شیعر، هەروەکو دەبینین، ئەحمەد هەردی کە هەرگیز ئەو چەپکە شیعرەی لە

کتێبخانەی کوردیدا ناخەون و هەمیشە چێژ لە خوێندنەوەیان وەردەگیرێ، ئێ خۆ لە سەردەمی ژیانی هەردیدا شاعیری دیکەشمان هەبوون و زۆریشیان هۆنیوەتەوە، بەڵام وەک هونەر و سەلیقەی شیعری نەیانگەیاندووە بە شکۆی ئەو. پاش ئەوەش، دەبێ بڵێم من درەنگ بۆم ڕێک کەوت خۆم دەربخەم، هەر ئەوەندەم پێکرا و خۆم لە زۆروبۆریش پاراستووە و بە سڵەوە لە مەیدانی هونەردا هاتوومەتە گۆ. با هەروا بەسەر ئەوەشدا تێنەپەڕم کە ئەنوەر قەرەداغی و فرەنسیس داود یارمەتیدەرێکی لێوەشاوەی دەنگی من بوون، عیشقی خۆیان تێکەڵ بە شەیدابوونەکەی من کردبوو بۆ بەرزڕاگرتنی ئاڵای هونەری مۆسیقا و گۆرانی.

کە لەگەڵ خۆیدا بەو هونەرە چوارشانەیەوە باسی ڕۆڵی هەردوو هونەرمەند کاک ئەنوەر و کاک فرەنسیسی کرد، بۆ ماوەیەک خەیاڵم چووە سەر ئەم دوو زاتە، کە ئەو پەیکەرە دەستی ڕێز دەخاتە سەر شانی بەشکۆیان، لە کانگای دڵەوە کەوتمە پاڕانەوە لە خودای گەورە و گوتم: ئیلاهی ئەم دوو هونەرمەندە مۆسیقاژەنەت پێبەخشین، من بە چ جۆرێ بتوانم شوکرانەبژێرت بم؟ خۆ ئەگەر ئەم دوو زاتەمان نەبووایە، ئەوا پایەکی سازوئاوازی نوێمان لەنگ دەبوو.

یەک یەک ئەو گۆرانیبێژانە هاتنەوە یادم، کە لەژێر سەیوانی ئەم دوو پیاوە بەرزەدا چریکاندیان و گەلێک لە گۆرانیمان هونەری بەرجەستەیان بە باڵا بڕا و ماندوونەناسانە درێژەیان بە کار و چالاکیی خۆیان داوە.

شنۆی حەیرانبوونم بەرامەیەکی بێهاوتای کردە جمکی خەیاڵم، خەیاڵ سروشتی بای هەیە، لە هیچ گوزەرێکدا ئارام ناگرێ. منیش ئەگەرچی بۆ زیارەتی پەیکەر هاتووم، کەچی هەموو جادە و بان و شەقام و کۆڵانەکانی سلێمانی هاتنە سەر پەڕەی دیەم و بە خۆم گوت: خۆ ئەم شارەی نالی و ئیبراهیم ئەمین باڵدار و ئەحمەد سالار و شێرکۆ بێکەس و کەژاڵ ئەحمەد پڕە لە پەیکەری شایان و دارماڵە لە ناونانی قوتابخانە و شەقام و باخچە و چاپخانە بە ناوی کەسایەتییە پایەبڵندەکانەوە، ئەوی بە سەری زیندوو بۆچی دوو پەیکەریش بۆ کاک ئەنوەر و کاک فرەنسیس چێ ناکەن؟ ئایا ئەم کارە ڕەوا...

– بۆ بێدەنگ بووی؟

منی سەرمەست کە بە سەرنجی وردەوە کەوتوومەتە تەفەڕنجی شوێن بە شوێنی شار و بیر لەو هەموو سەروەرانەی ئەدەب و هونەر و سیاسەتی شاری هەڵمەت و قوربانی دەکەمەوە، کە ئەگەر سەرژمێریان بکەین، دە هێندەی لەشکر و تاقمە مومتازەکەی ئەحمەد پاشای بابان دەبن، بەو پرسیارە ڕاچەنیم و خۆمەن هاتمە گۆ:

* ئەزبەنی... پێت چۆنە پێشنیازێک ئاڕاستەی سەندیکای هونەرمەندان بکەم؟

– بیڵێ بزانم چیە؟

* داوا دەکەم بە تەنیشتتەوە شاشەیەک دابنێن گۆرانییەکانتی تیا پەخش بکەن، کە ئەوەش سەفایەکی دی دەبەخشێ بە ڕەونەقی شارەکە.

چاوەڕێی وەڵام بووم، نەبوو. زەنگێک دای لە دەرگای هۆشم و بە دوایدا دەنگێکم بیست: (ئەوە ئەرکی سەرشانی ئێمەیە وەک سەندیکای هونەرمەندان چ خزمەتێک لەو ڕووەوە پێویست بێ، بیکەین بۆ ئەو هونەرمەندە بەرزە و هەر کارێکی دیکەی لەو بابەتە).

بەر لەوەی من قسەی خۆم بکەم و ئەو ڕاستییەی پێ ڕابگەیەنم، ئەو بە سیمایەکی گەشەوە گوتی:

– سوپاستان دەکەم و دەستی یەک بە یەکیان دەگوشم.

* هی کێ؟ بەڕێزم.

– سەندیکای هونەرمەندان... منیش گوێم لێبوو کە بەنیازن بێن بەدەم پێشنیازەکەتەوە.

***

بێدەنگ بێدەنگ وەستاوم و چاوانم لەو پەیکەرە هێژایە ناترووکێنم، ئەویش جارجار شەونمی خەندەیەک دەتکێتە سەر ترۆنجکی لێوی. بەبێ ئەوەی هیچ بڵێ، لە خەندە گزنگدارەکەیدا گەلێ شت دەخوێنمەوە، کە هەر هەموویان نێرگسی نێو مێرگی ویژدان و دڵهاوەری خاک و گەلن. بێدووان پێمان دەڵێ:

"زۆر بەختیارم کە نەتەوەکەمان لە دهاری ڕزگاری نزیک بووەتەوە و ئاهەنگ بۆ جەژنی سەرفرازی ساز دەکەن".

"شادم بەوەی دەسەڵات بە هەموو جۆرێ لە ئاوەدانکردنەوەی هەرێمەکەماندایە".

"بریا هەرەتی جارانم بووایە و شیعرێکی هەڵقوڵاوی ناخی کوردپەروەرێکی ڕەسەنم بکردایەتە گۆرانی بۆ باڵای پێشمەرگە".

"کاشکێ لایەنە سیاسیەکانمان کورد کوردێنەیان بخستایەتە سەرووی حزب حزبێنەوە".

"خۆزگە بیری من ئەحەسایەوە
جارێ وەک گوڵەباخ ئەگەشایەوە
سەهۆڵبەندانی کوێستانی پەستیم
بە گەرمیی ئاوات ئەتاوایەوە
ئاواتەکەیشم ئەوەیە برا
ترازووی ڕاستی خێرا هەڵئەخرا
(ڕاستی) و (شەرەف) و (پلەی زانیاری)
هەموو کەس وەک خۆی کێشانە ئەکرا"

"گەلێک سوپاس بۆ هونەرمەندی پەیکەرتاش – ڕەنج عوسمان چێوار – کە ئەم کاڵای بە قەد باڵام بڕی".

بیرم کردەوە ئەم (مەزدامیر)انەی (زەبوور) لە ئەمڕۆی ژیانی ئێمەدا دەژین و بە چریکە و سۆزی (داود)یانە بەرەو ئاقاری بەختەوەریمان

دەبەن. ئای هونەرمەندە گەورەکە، ناخت تژییە لە هەڵوێستی کوردایەتی و مەردایەتی، تۆیش بە ئاواز وەکو گۆرانیبێژە گەورەکانی دیکەمان لە ڕۆژانی نەهاتی و نەهامەتیدا سەری گەلتان بەرز و بەرزتر کردەوە، کە بوونەتە ناسنامەیەکی هونەری بۆمان و شەڕە هونەری ئێوەیش شەڕێکی ڕەوا بوو بۆ سەربەرزیمان. چونکە گەلی بێهونەر بێهونەرە و پەلێکی گۆجە، ئێمە چریکەی ئێوە دەدەینە دەست (کۆنفێشیۆس) و دەڵێین: فەرموو ئەوە ناسنامەکەمان. دەک هەموومان قەرزاری ڕۆژی پەسڵان بین ئەگەر لە بیرتان بکەین.

***

زانیی پێیەکانم تەزیوون و بێتاقەتم بە دەستیانەوە، نیان نیان مۆڵەتی دام بڕۆم پشوویەک بدەم. منیش لەگەڵ کەوتنەڕێدا جگەرەیەکم پێکرد و دەستم بە پیاسەکردن کرد، خۆ ناکرێ دووکەڵی جگەرە هەڵدەی بە ڕووی ئەو کەڵەپیاوەدا و ناشکرێ پێ بجووڵێنیت، چونکە سەرباز لە بەرامبەر کەسێکی پلەداردا ئەوە پیشەیەتی، پەیکەرەکەش بەو پلەوپایە بەرزەوە کە بە دەستی هێناوە، دەبێ هەم بە ڕێزەوە ڕووبەڕووی بوەستین و هەم بە دووکەڵی بخوور شاباشی بکەین.

دوا مژم لە جگەرەکە دا و گەڕامەوە خزمەتی، دوای سڵاوێک وتم:

* قوربان ڕێگە دەدەی یاخود پێت خۆشە پرسیاری تر بکەم؟

- بەڵێ، بۆ نا...

* گۆرانییەکانت یەکدەنگییان پێوە دیارە، ئەمە چۆن ڕێک کەوتووە؟

- من هەموو هەوڵی خۆم لەوەدا چڕ کردووەتەوە، کە هەر خۆم بم و لە کەس نەچم، تەنانەت دەنگم لەگەڵ دەنگی شەهید قادری برامدا جیاوازە، ئەوە یەک و دوو لە سنووری سلێمانی – شارباژێڕ و سیوەیلدا دوو ئاوازی لەمێژینەمان هەبووە بە ناوەکانی (دڵسۆز) و (دیلان)، بەڵام هەرگیز بیرم لەوە نەکردووەتەوە کە ئەو دوو ئاوازە بێنمەوە ناو ئەمڕۆی ژیانی هونەرییمان، خۆ ئەگەر ئەو کارەم بکردایە، ئەوا دەبوومە دەنگەوەرە و ئەمە دەرنەدەچووم کە خۆم هەڵمبژاردووە. ئەو دوو ئاوازەش خۆشن خۆش. مەولەوی تاوەگۆزی لە شیعرەکانیدا ناوی هەردووکیانی بەسەر کردووەتەوە. بۆ ئاوازی دڵسۆز فەرموویە:

بڵندکەر مەقام (دڵسۆز) وە (ڕاس)ی
تەنزیلەش فەردگەل خاڵۆی کۆماسی.

بۆ ئاوازی (دیلان)یش فەرموویە:

جەتەنخوای نەی بەزم خەم وەیلانەوە
هۆر دەرئی چەند فەرد وە (دیلان)ەوە.

ئەم ئاوازی ئاهەنگی دووەمە حەمەساڵح دیلان جوان زیندووی کردووەتەوە، بەڵام بە داخەوە حەزی نەدەکرد پێی بگوترێ گۆرانیبێژ.

هەروەها بیستوومە ئاوازێکی دیکەمان هەبووە بە ناوی (سەفەر)، ئەمەیان بە باشی ناناسم، ئەگەر بشمزانیایە، ئەو بە ڕێیدا نەدەچووم. براله بە کوردی و بە کورتی پێت بڵێم: من لە هونەردا ویستوومە پشکی خۆم هەبێ و پاروو لەسەر خوانی کەسی دی دانەگرم. دە ئیتر بەخێرهاتیت و من زۆر بێتاقەتی ئەم گێچەڵەی (دا–عییش)م، کە بەرۆکی گەلەکەمانی گرتووە، وازبێنە و (لێم گەڕێ با دەستە ئەژنۆ دابنیشم کەف زەنان).

کە وشەی (عییش)م بەر گوێ کەوت، قاقایەکم بۆ هات، بەڵام لەبەر شکۆمەندیی ئەو کپم کردەوە و بە سەردانەوانێ خوداحافیزیم لێکرد و تا گەشتمە سەر سیلەیەک، پەیتاپەیتا لایەکم دەکردەوە و دڵم ئۆخژنی دەهاتێ.

### کەریم کابان لە زاری خۆیەوە

# لە ژیانی خوێندکاریمدا

ژیانی خوێندنی من لە حوجرەوە دەستی پێکردووە، لە حوجرەدا مەلا دەرسی قورئانی پێدەوتین. هەروەها بێجگە لە خوێندنی قورئان، هەندێ حەرفی (ئەلف و بێ)یان بۆ ئەنووسین، بۆ ئەوەی لەگەڵ خوێندنی قورئاندا حەرفەکانی ئەلف و بێش بزانین. لە سەرەتای ساڵی سییەکاندا بوو، کە من لە حوجرەدا بووم، منداڵ بووم، دایکم بە کۆڵ دەیبردم بۆ حوجرە، لەگەڵ خوێندنی قورئان و ئەلف و بێدا کتێبێکی فارسی هەبوو، کە پێیان دەوت (گوڵستانی شێخی سعدی)، کە دیوانە شیعرێکی فارسیی (شێخی سعدی) بوو، ئەوەشیان هەر پێدەخوێندین. من لە حوجرە بە تەواوەتی فێری خوێندەواری بووم. بە بیرم نایەت کە نەخوێندەوار بووبم، دوای ئەوەی کە من هەموو قورئانم خەتم کرد و هەموو گوڵستانەکەشمان خوێند، لە دوای ئەوە باوکم منی خستە قوتابخانەی کانێسکانی سەرەتایی، کە یەکەم مەکتەب بوو کرایەوە. دوو

پۆلی تێدا بوو، من چوومە پۆلی یەک، بەڵام سەیری دەرسەکانم دەکرد هەموویم دەخوێندەوە، چونکە پێش ئەوە فێر ببووم، چوومە لای بەڕێوەبەری خوێندنگاکە، کە ئەو کاتە (عزیز فەنی) بەڕێوەبەر بوو، پێم وت: من ئەوانە هەمووی دەزانم، ئیتر ئەویش ئیمتیحانێکی کردم و لەبەر ئەوەی کە زۆر زیرەک بووم، لە پۆلی یەکەمەوە بردمیان بۆ پۆلی دوو. لە دوای ئەوەی دەرچووم بۆ پۆلی سێ، نەقڵیان کردم بۆ قوتابخانەی فەیصەلیەی سەرەتایی و لەم قوتابخانەیە لەبەر ئەوەی کە دەنگم خۆش بوو، منیان خستە تیپی سروود. لە کاتی خوێندنی ئێمە دنیا زۆر پێشکەوتوو نەبوو، لە دوای ئەوەی چوومە قوتابخانە، پاش دوو سێ ساڵ جەنگی جیهانی دووەم دەستی پێکرد. دنیا بوو بە گرانی. قوماش و شت لە بازاڕدا نەما، خواردەمەنی زۆر گران بوو. لەبەر ئەوەی کە قوماش گران بوو، جلەکانمان پینە دەکرد، بە هەمان شێوە پێڵاوەکانیشمان پینە دەکرد و دەرسیشمان دەخوێند. لە کاتی ئەم جەنگەدا ئینگلیزەکان لە ژێر ئیدارەی (عەلی مەلا شەریف) ئێسگەیەکی ناوچەییان دانابوو. ئێسگەکە بریتی بوو لە ئەمپریفایەرێک و مایکرۆفۆنێک، کە لە بەردەرکی سەرا هەندێ بلَندگۆ (مکبرە) دانرابوون، کە دابەش کرابوون بەسەر سێ چایخانەی گەورەی بەردەرکی سەرا، کە بە زۆری خەڵکی سلێمانی لەو چایخانانەدا دادەنیشتن. من لە لایەن بەڕێوەبەرایەتیی زانیاریی سلێمانی نێردرام بۆ ئەو ئێسگەیە بۆ گۆرانیوتن. ئەو ئێسگە ناوچەییە بۆیە دانرابوو لە سلێمانی، بۆ ئەوەی دەنگوباسی جیهان بگەیەنێت بە خەڵکی، چونکە ئامێری ڕادیۆ زۆر زۆر کەم بوو، مەگەر ماڵە دەوڵەمەندەکان ڕادیۆیان هەبووایە،. من لەو کاتەوە دەستم کردووە بە کاری هونەری و لە ساڵی 1942 چوومە قۆناغی ناوەندی، دەفتەر و قەڵەم زۆر بە زەحمەت دەست دەکەوت. لە دائیرەکانی حکوومەتدا کاغەزمان کۆ دەکردەوە و بە دەرزی و دەزوو بەیەکەوەمان ئەنان و ئەمان دووری و شتمان لەسەر دەنووسی. لە دوای دەرچوونم لە پۆلی سێی ناوەندی، لەبەر بژێویی ژیانم لە سلێمانییەوە چووم بۆ بەغدا بۆ ئەوەی بچمە خانەی مامۆستیایانی ڕیفی. کە چووم، بە داخەوە جێگە نەمابوو، لە دەوری ساڵی 1945دا بوو، لە تەمەنی 18 ساڵیدا بووم. منیش لەوێ هاتمەوە بۆ ئوتێل لە بەغداد. هەندێ برادەرم وتیان وەرە بۆ دەورەی لاستیکی پۆلیسی، منیش ئەوراقم تەقدیم کرد لەوێ وەرگیرام و هەر لەوێ پەیوەندیم کرد بە بەڕێوەبەرایەتیی ڕادیۆی بەغداد بەشی کوردی، کە کاک (کامیلی کاکە ئەمین) لەوێ بوو، لەبەر ئەوەی منی دەناسی، کە خەڵکی سلێمانی بوو و دەیزانی دەنگم خۆشە، داوای لێکردم ڕۆژانی هەینی سەعات (5) ئێواران بچم بۆ ئێستگە گۆرانی بڵێم هەتا ٥:٣٠. کاری هونەریم لەم کاتەوە بە تەواوی دەستی پێکردووە. من کۆی بەرهەمەکانم هەتا ئێستا نزیکەی (20) گۆرانییە و زۆریشی ئاوازی خۆمە، هەروەها ئاوازم داناوە بۆ شەهید قادر کابانی برام خوا لێی خۆش بێت، هەروەها خوالێخۆشبوو کاک عوسمان عەلی و هونەرمەند کامەران عومەر، هونەر لای من بەشێکە لە ژیانم. هەتا بتوانم وازی لێناهێنم، کە نەشمتوانی ئیتر دەسەڵاتم نییە.

# لاپەڕەیەك لە ژیان و بەرهەمەكانی
# كەریم كابان


**نووسینی ئێتنۆموزیكۆلۆجیست:**
**توانا حەمە**


ناوی تەواوی: عەبدولکەریم جەلال مەحمود، نازناوی: (کەریم کابان)ە، لەدایکبووی 24/2/1927، گەڕەکی مەڵکەندیي شاری سلێمانییە. نازناوی خانەوادەکەیان کابانە، خانەوادەی کابان نازناوەکە بۆ دایەگەورەی خانەوادەکەیان دەگەڕێننەوە، کە ژنێکی خانەدان و خاوەن دیوەخان بووە، لەبەر لێهاتووی ئەم خاتوونە کوردە بە (کابان) ناوبراوە و ئەم نازناوەیان بۆ بەجێ ماوە. بەڵام شوێنەوارناسی گەورەی کورد د. ڕافیدە  پێی وایە: ئەم نازناوەی کابانەکان ڕیشەیەکی کۆنی هەیە، بەڵگە بۆ ئەوە، دەڵێت: "لە نێو دەقە مێخییەکاندا لە 714 پ.ز لە کاتی باسکردنی لەشکرکێشی سەرجوونی دووەمی ئاشووری بۆ (ئۆرارتۆ)  هێریشی کردووەتە سەر دەوڵەتی (کابان – کابانو) کە دەکاتە ناوچەی قەڵادزێی ئەمڕۆمان" < ڕافیدە، چاوپێکەوتن: 2015>، ئەو پێی وایە کە ڕیشەی ئەم نازناوەی کابانەکانی شاری سلێمانی بۆ ئەو ڕیشە مێژووییە دەگەڕێتەوە. باوکی کابان، پیشەی چایچی بووە، لە هەمان کاتدا دەنگخۆش و

دەفژەنێکی لێهاتووی نێو مەولودخوێنانی شاری سلێمانی بووە.
دایکی ناوی (حەلاوە عەلی)یە، لە بنەماڵەیەکی دیاری شاری سلێمانی بووە. کابان قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی لە (قوتابخانەی فەیسەڵیە) و خوێندنی ناوەندی لە شاری سلێمانی بووە. دواتر لە ساڵی 1953 ژیانی هاوسەرێتیی پێک دەهێنێت، لەگەڵ (عائیشە محەمەد خونچەلە)، کە بنەماڵەیەکی دیاری شاری سلێمانین و دەبنە خاوەنی شەش منداڵ بە ناوەکانی "نوخشە، شوان، بەرزان، چنور، چیمەن، سۆران".
دواتر کابان دەبێتە پۆلیس و بە هۆکاری ئەم پیشەیەی لە ناوچەکانی وەک: سیدەکان، ڕەواندز، ڕانیە، بەغداد... هتد بەشێکی زۆری تەمەنی لە ژیانێکی کۆچەریئاسادا بەسەر دەبات. دواتر بە هۆی کوردایەتی و سیاسەتەوە لە لایەن ڕژێمی بەعسەوە خۆی و خانەوادەکەی بۆ ناسریە، دیوانیە، ڕمادی، نەجەف... ڕادەگوێزرێن.
دواتر لە دوای ڕێککەوتنی 1970ی نێوان سەرکردایەتیی ئەو کاتی شۆڕشی کورد و ڕژێمی بەغداد، وەک بەشێک لە ڕێککەوتنەکە ئەوانەی لەسەر کوردایەتی ڕاگوێزرابوون، پێویستە بۆ زێدی خۆیان بگەڕێنەوە. کابان و خانەوادەکەی لە دوای ئەم مێژووە بۆ شاری سلێمانی دەگەڕێنەوە.

ژیانی هونەری...
بە بڕوای من، بوونی بەهرەی دەنگخۆشی لە کاباندا بۆ (بۆماوەیی) دەگەڕێتەوە. چونکە وەک پێشتر ئاماژەم پێدا، (جەلال مەحمود)ی باوکی کابان (دەنگخۆش و دەفژەنێکی لێهاتووی سەردەمەکەی خۆی بووە)، دواجار ئەمە کاریگەریی تەواوی لەسەر دەنگ و هونەری (کابان) هەبووە. دواتریش بەهرەی دەنگخۆشی لە (قادر کابان) ی برایدا دەبینرێت و دواتر هەمان بەهرە لە نەوەکانی کابانەکاندا تا ئێستاش ڕەنگدانەوەی هەیە. ئەو خۆی سەرەتای کاری هونەری بۆ سەردەمی منداڵی دەگەڕێنێتەوە، کە بۆ یەکەم جاریش وەک دەنگخۆشێکی قوتابخانەی (فەیسەڵیە) بۆ گۆرانیگوتن دەنێردرێتە ئەو ڕادیۆیەی کە ئینگلیزەکان لە بەردەرکی سەرای شاری سلێمانیدا دایانمەزراندووە، کە پەخشەکەی ڕاستەوخۆ بووە و گۆرانییەکان تۆمار نەکراون، کابان سەبارەت بەمە دەڵێت: "بۆ یەکەم جار لە ڕادیۆی بەردەرکی سەرا کە ئینگلیزەکان ئێستگەیەکی ڕادیۆیان بۆ پڕوپاگەندەی خۆیان دانابوو، لە قوتابخانەوە منیان نارد و گۆرانیی فۆلکلۆری و نیشتمانیم تێدا دەگوت، بەڵام هیچ ئامێرێکی موزیکی هاوشانی گۆرانیگوتنەکەی نەدەکردم. ئەمە دەستپێکی هونەریی منە" <کابان، چاوپێکەوتن، 2013>.
دواتر هەر ئەم کرانەوەی دەروازەیەی منداڵی وا دەکات کابان لە ساڵی 1945 بە دواوە وەک دەنگخۆشێکی شاری سلێمانی دەرکەوێت و لەگەڵ تیپی ئێستگەی کوردی بەغداد و باشترین تیپە موزیکییەکانی وەک: مەولەوی (کۆن و نوێ) و تیپی پیرەمێرد کار بکات.
دواتر دەبێتە یەکێک لە ئەندامە هەرە دیارەکانی تیپی موزیکی سلێمانی. بە داخەوە گەرچی ئەندامی باشترین تیپی موزیکی ئەو سەردەمە بووە، لەگەڵ ئەوەشدا دەبینرێت کە کابان بە هۆکاری پیشەکەیەوە نەیتوانیووە وەک هونەرمەندێک تەنیا سەرقاڵی هونەرەکەی بێت.
هەربۆیە دەبینین، سەرەڕای تەمەنی هونەری و ناوبانگ و ئەو پایە گەورەیەی کە لە ڕابردوو و ئێستادا لە هونەری موزیکی کوردیدا هەیەتی، ئەو خاوەنی کەمترین بەرهەمی هونەریی تۆمار کراوە.

کابان لە ڕووی تەکنیکی گۆرانیگوتنەوە خاوەنی ناسنامەیەکی کوردییانەی تایبەتمەند بە خۆیەتی، کە دواتر کاریگەریی گەورەی لەسەر تاکی نەتەوەکەی بەجێ هێشتووە، بەرهەمەکانی لە ناوازەترین بەرهەمەکانی سەردەمی خۆین. تا هەنووکە لە یادەوەریی خەڵکدا جێگەیان هەیە و

بەرهەمەکانی
بە زیندووی ماونەتەوە.

گەرچی ئەو هیچ ئامێرێکی موزیکی نەزانیووە و تەنیا بەهرەیەکی خۆڕسکی هونەری لە ڕۆحیدا هەبووە، کەچی زۆرینەی بەرهەمەکانی لە ئاوازی خۆین، کە دەتوانم بڵێم بە هەموو جۆرێک چەمکی ئاوازدانانی هاوچەرخی کوردی سەردەمی خۆی، بۆ موزیکی کوردی لە نێو ئاوازەکانیدا دەبینرێت. بەڵگەش بۆ ئەمە، زۆرینەی تویژەرانی موزیکی کوردی لەسەر ئەوە کۆکن، ئەو گۆرانییە کوردییانەی کە زیاتر لە لە چوارینەیەک یان ئۆکتاڤێک بواری دەنگیانە، ئەوانە دەچنە خانەی موزیکی دانراوی کوردییەوە و فۆلکلۆر نین.

ئەگەر بڕوانرێتە گۆرانییەکانی دانراوەکانی کابان، ئەو تایبەتمەندیە دەبینرێت، کە موزیکی کوردیی دانراوی پێدەناسرێتەوە. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا ناتوانرێت بگوترێت کارەکانی هیچ خەوش و ڕەنگدانەوەیەکی موزیکی نەتەوەکانی وەک: (هیند، عەرەبی، فارسی) بە بەرهەمەکانیەوە دیار نییە، کە بڕوای من ئەو ڕەنگدانەوەیە گەر بوونی هەبێت، ئاساییە، چونکە موزیک بە هەر زمانێکی دی بدوێت، کاتێک کە گوێڕادێری ببیت، کاریگەریی ناڕاستەوخۆ لەسەر هەستە ناوەکییەکانی و ئەندێشەی موزیکی مرۆڤ دروست دەکات. کابانیش وەک هونەرمەند و مرۆڤێکی کورد لە نێو تەنگەژەی سیاسی و نەبوونی دەوڵەتێکی سەربەخۆدا و بە هۆی ئەوەی گەلەکەی هەمیشە ژێردەستەی نەتەوەکانی دی بووە، بەشێک لە پەروەردەی هونەریی ئەو، بە گوێگرتن لە موزیکی نەتەوەکانی دی بووە و دواجار ئەویش نەیتوانیووە خۆی لەو کاریگەرییانە بپارێزێت. سەرەڕای ئەوە، دەنگ و خامەی دەنگی کابان تەواو ناسنامەی کوردبوونی

کابان
زرۆڤەدر

لەخۆی گرتووە، بە جۆرێک، دەتوانرێت بە تەواوەتی لە نەتەوەکانی دی جیا بکرێتەوە.
کابان کۆی گشتی بەرهەمەکانی شازدە گۆرانییە: کە نۆیان ئاوازی خۆیەتی. هەروەها پێنج گۆرانی لە ڕادیۆی بەغداد لە ساڵانی 1945 تا1950 تۆمار کردووە و چەند بەرهەمێکی فۆلکلۆریی ناوچەی سلێمانیی تێدایە. دواتر لەم ساڵانەی دوایشدا دوو مەقامی بڵاو کراوەتەوە. کە جێی هەڵوەستەکردنن، چونکە کابان زیاتر وەک (بەستە)چڕێک ناوبانگی هەیە، پێشتر کەم کەس لە دەنگی کابان گوێبیستی مەقام بووە، بەڵام لە ڕاستیدا توانای (مەقامبێژی) ی جێگەی سەرسوڕمانە و پرسیارێکی گەورەیە، کە بۆچی بە هەموو توانایەوە، کەمترین تۆماری لە ڕووی (مەقامبێژی)یەوە هەیە و وەک مەقامزانێک نەناسراوە؟!!

ناوی بەرهەمەکانی
جادە چۆڵ و سێبەر بوو (ئاوازی: کەریم کابان، وتنی: قادرکابان)، یاران وەسێتم، گیانە لە پرخەی خەوی خەوما، بەژنی تۆیە، دڵی گیرۆدەی، بڵێن بەیار، (دۆستی دێرین: وتنی: عوسمان عەلی، بیرتەکەم ئاواز (کابان) وتنی: کامەران عومەر، ڤینۆس). سەرەڕای ئەم بەرهەمانەی، توانیوویەتی چەند گۆرانییەکی کۆنی فۆلکلۆری ناوچەی سلێمانی لە ڕادیوی بەغداد تۆمار بکات، لەوانە: یارجوانە (گۆرانییەکی دیاری جوولەکەکانی سلێمانییە)، گوڵاڵەسوورە، تەماشای خاڵی سەر ڕومەتی کە (فۆلکلۆری سلێمانییە، بەڵام زۆر جیاواز وتویەتی).
کابان دوا بەرهەمی بە ناوی (تەمەن بوو)، کە هۆنراوەی ئەحمەد محەمەد و ئاوازی زانا مەحمود هەژارە. کە دوای دابڕانێکی زۆر ئەم گۆرانییە جێگەیەکی تایبەتی هەبوو لە نێو هەواداران و هاوسەردەمانیدا.
لە کۆتایدا دەمەوێت ئەوە بخەمە ڕوو کە لە سەردانێکمدا لە ساڵی 2013دا کە وەک ئێستای هەر لە بارێکی تەندروستیی خراپدا بوو، سەرەڕای ئەوە میوانداریيەکەیان قبوڵ کردین، بە هۆکاری

باری تەندروستی تەنیا حەزمان کرد چەند وێنەیەکی لەگەڵ بگرین و ماندووی نەکەین. بەڵام ئەو بە دڵێکی خۆشەوە خۆی ئامادەی چاوپێکەوتن کرد، بۆیە دڵمان نەشکاند و چەند وردەپرسیارێکمان ئاراستە کرد. ئەو یەکێک لە خۆشترین ساتەکانی ژیانی لە سەردانێکی بۆ ڕۆژهەڵاتی کوردستان و کۆنسێرتەکەی سنەی دەگێڕێتەوە و دەیگوت: "ئەو ڕێزەی لە سنە لێم گیراوە، قەت لە بیری ناکەم". هەروەها لەگەڵ سەیرکردنی ئەلبومەکەیدا کە کەم کەسی لە هاوڕێیانی دەناسییەوە جگە لە وێنەکانی قادر کابانی برای، کە ئاه و حەسرەتی هەڵدەکێشا و پەنجەی دەخستە سەر وێنەکەی و دەیگوت: ئەوە قادری خێرلەخۆنەدیوی برامە". ئەو دواین کاتەکانی تەمەنی بە نۆستالژیای ڕابردوو و پیرییەکی تاقەتپڕوکین و تەندروستییەکی ناجێگیرەوە لە خانوویەکی شارەوانیی سلێمانیدا لەگەڵ کچێکیدا بەڕێ دەکات. تا هەنووکە هەر کەسێک کە سەردانی ئەکات، هێشتا باڵای هونەر و عەشق لە نێو باڵای تەمەنیدا دەبینێت. گەرچی کابان باری تەندروستیی ناجێگیرە، بەڵام زۆر دڵخۆش دەبێت بە گفتوگۆی هونەری و ئەو هێشتا (گۆران) لە لوتکەدا دەبینێت و بە شاعیرێکی ناوازە باس لە توانا شیعرییەکانی (گۆران) ی شاعیر دەکات. لەگەڵیدا بە نەشئەیەکی پڕ حەسرەت و گەروویەکی نوساوی پیرییەوە، چەند دێڕیک لە تیکستەکانیت بۆ دەڵێت. کابان تا هەنووکە بە بەردەوامی گۆرانی و مەقام لەبەر خۆیەوە ئەچڕێت.

سەرچاوە: دەربارەی ژیانی کابان سوودم لەم چاوپێکەوتنە تایبەتانە وەرگرتووە.

کابان کەریم، ت: توانا حەمە، سارا لەتیف، سلێمانی، چاوپێکەوتن: 7/4/2013.

د. ڕافیدە، ت: توانا حەمە، سلێمانی، چاوپێکەوتن: 8/1/2015.

کابان شوان، توانا حەمە، سارا لەتیف، سلێمانی، چاوپێکەوتن:13/4/2014.

کابان کاروان، توانا حەمە، سارا لەتیف، چاوپێکەوتن، 2013 /31/3

کابان بەرزان، توانا حەمە، پەیوەندی، 2015.

وێنەکان: توانا حەمە، سارا لەتیف

# هونەرمەند کەریم کابان.... تەمەنێك لەپێناو هونەردا

**جەمالی ڕەزازی**

زۆر دەمێک بوو ئاواتەخوازی ئەوەبووم ڕۆژێک بێت و بتوانم پێنووس بگرمە دەست، وەک کەسێکی هونەردۆست چەند وشەیەک ڕیزبەندی بکەم و بیکەمە ملوانکەیەک و لە گەردنی هونەری هونەرمەندێک کە تەمەنێکی زۆر و هونەرێکی پوخت و گەورە و بەنرخی پێکەش کردین، هەڵبواسم، سوپاسگوزاری یەزدانم کە ئەو ئاوات و دەرفەتە ڕەخسا بتوانم خزمەتێکی بچووک بە کەسایەتی و هونەرە بەرز و هەمیشە لە دڵدا شیرینەکەی هونەرمەند کەریم کابان بکەم، بەڵام زۆر زەحمەتە

وەک کەسێکی ئاسایی بتوانم پەی بە تەواوی ژیان و کارە هونەرییەکانی بەرم.
ماوەیەکە لەو هونەرمەندە ئازیز و گەورەیە دابڕاوم، ئەویش بە هۆی گواستنەوەی کار و شوێنی نیشتەجێبوونم، بەڵام لە ڕێگەی چەند بەڕێزێکەوە دوراودوور گوێبیستی هەواڵی هونەرمەند کەریم کابان دەبم، بە ڕاستی بیری دەکەم و تامەزرۆیی دیداریم. بەهەرحاڵ، داواکارم لە پەروەردگار لەشساغ و تەندروست بێت، خۆشترین کات ئەو ساتانە بوو کە یەکێک لەو کەسایەتییە بەهرەمەند و نووسەر و ئەدیب و شاعیر و... سەردانی سەرتاشخانەی (ڕەزازی)یان دەکرد و بەندەش لە خزمەتیاندا دەبووم، بۆ من سەردەمێکی گەلێک بەنرخ و بەسوود بوو، دوکانەکەم جیا لە کارکردن تێیدا، بەڵام هەمیشە جێی باسوخواسی هونەری بوو لەگەڵ ئەو بەڕێزانەی تەشریفیان دەهێنا.
هونەرمەند کەریم کابان یەکێک بوو لەو کەسایەتی و هونەرمەندانە، هەر کاتێک لە ماڵ دەرکەوتایە و بە مەبەستی هاتنی بۆ ناوبازار بەیانیان یان دەمەوعەسران سەرێکی لە شەقامی گۆران دەدا و لە دەرەوە لە ناو دوکانەکەمی دەڕوانی، سەردەکەوت و دەهاتە ژوورەوە، پاش کەمێک هەواڵپرسین و گفتوگۆکردن لەگەڵ یەکتری، پێی دەوتم جەمال تۆ بڵێی حاجی لەوێ بێ، دەچمە سەرەوە بۆ لای، (حاجی) کەسایەتییەکی ناوداری شاری سلێمانییە (باقی حاجی حەسەنی هەورامی) خاوەنی میوانخانەی مەولەوی. کەریم کابان هاوڕێیەتی و دۆستایەتیی لەگەڵ کاک باقی زۆر خۆشە و ئالوودەی یەکتری بوون، چونکە کاک باقی هەورامییش مرۆڤێکی ڕۆشنبیر و شارەزایە لە بواری هۆنراوە و ئەدەبدا، شوێنی حەوانەوەی کاک باقی لەو میوانخانەیە ببووە خەڵوەتگەیەک بۆ کەریم کابان و باقی حاجی حەسەن و چەند کەسایەتییەک کە بەردەام ئەو ساتانەیان بە قسەی خۆش و باسکردن لە هونەر و ئەدەب و هۆنراوەدا بەسەر دەبرد.

جگە لەو دیدارانە، چەندین جاری تر لە خزمەتی ئەو هونەرمەندە گەورەیەدا بووم لە چەندین ئاهەنگدا، لە ئاهەنگی جەژنی لەدایکبوونی هونەرمەند ناسری ڕەزازی لە ساڵی (2001) و یەکێک لەو ئاهەنگانەی کە هەرگیز لەیادم ناچێت، ئاهەنگی هونەرمەندی کۆچکردوو (هابە) لەگەڵ ناسری ڕەزازی لە سلێمانی لە (14/6/2001)، هونەرمەند کەریم کابان و هونەرمەندی کۆچکردوو (مەحموودی تۆفیق شلک) میوانی ئەو شەوەئاهەنگە بوون. کەریم کابان بە یەک دوو گۆرانی بە دەنگە بەسۆزەکەی بەشداریی ئەو شەوەئاهەنگەی کرد و سەلماندی هەڵکشانی تەمەن نەبووەتە ڕێگر لە بەردەمیدا، خۆشەویستی و حورمەتم بۆ هونەرمەند کەریم کابان تا دەهات زیاتر دەبوو، بەتایبەت ئەو شەوەئاهەنگەی شەوی (21/6/2005) کە کۆتاییەکەی کارەسات و تراژیدیا بوو بۆ هەمووان و بە کۆچی ناوەختی هونەرمەند عوسمان عەلی کۆتایی هات. ئەو شەوە هەموومان بەو کۆچە ناوەختە تاساین. کاتێک لە نەخۆشخانەی بوژاندنەوەی دڵ لە سلێمانی هەواڵی لەدنیادەرچوونی هونەرمەند عوسمان عەلییان پێ ڕاگەیاندین، من و کەریم کابان و ناسری ڕەزازی و چەند برادەرێکی تر لەسەر تەرمی ئەو هونەرمەندە نەمرە بووین، هەموو تاساو و دۆش دامابووین لە بەرامبەر جەستەیەکی بێگیان. هونەرمەند کەریم کابان باوەشی کرد بە تەرمی ساردەوەبووی ئەو هونەرمەندە، کە تەمەنێک هاوڕێ و هاوکاری یەکتری بوون، ڕووخساری نابوو بە ڕووخساری ساردەوەبووی عوسمان عەلی و تێی ڕامووسابوو، وا هەست دەکرا کە جگەرگۆشەیەک یان برایەکی ئازیزی لە دەست داوە، ئای کە شەوێکی ناخۆش و دژوار بوو.
هونەرمەند کەریم کابان هونەرمەندێکە لە ماوەی ژیانی هونەرییدا خاوەنی کۆمەڵە بەرهەمێکە کە ناتوانرێت هەروا بە سانایی لێی بڕوانی، لەبەر ئەوەی ئەو بەرهەمانەی تۆماری کردوون، هەمیشە

زیندوون و کاتێک مرۆڤ گوێبیستیان دەبێت، هەست بە ئارامیی دەروون و مێشک دەکات. سەرکەوتن و گەورەیی و بەنرخیی بەرهەمەکانی ئەم هونەرمەندە دەگەڕێتەوە بۆ ئاستبەرزی و هۆنراوە و ئاوازەکانی کە هونەرمەند هەڵیبژاردوون.
هەرچەندە بەرهەمەکانی کەریم کابان لە ئاست تەمەنیدا کەمن، بەڵام خەرمانێکی بەبەرەکەت و بەنرخی پێشکەش کردووە، کەهەریەک لەو بەرهەمانە تایبەتمەندیی خۆی هەیە لە ڕووی (ئەدا) و هۆنراوە و ئاوازەوە.
کەریم کابان خاوەنی دەنگێکی بەسۆز و گەروویەکی پاک و پاراوی کوردییە، کە دەنگی لە هیچ هونەرمەندێکی نە پێش خۆی و نە لە دوای خۆی ناچێت، دەنگێک پڕ لە بۆن و بەرامەی کوردەواری.
کەریم کابان مرۆڤێکە زادەی کۆمەڵگەی کوردەوارییە و وەک هەر تاکێکی ئەم میللەتە بێبەش نەبووە لە چەوساندنەوە و ستەم و سەختییەکانی ژیان. لە ژیانیدا ڕووبەڕووی گەلێک لە کێشە و تاڵییەکانی ژیان بووەتەوە، سەردەمی منداڵیی کەریم کابان، سەردەمی نەداری و قاتوقڕیی نێوان دوو جەنگە جیهانییەکە بووە، کە کاریگەریی لەسەر ژیان و گوزەرانی خێزانەکان بەگشتی داناوە. خانەوادەی ئەم هونەرمەندەش، بە هەمان شێوەی ژیانی ئەو خەڵکە، کاریگەری و ئازاری ئەو نەهامەتییانەیان چەشتووە.
کەریم کابان لە تافی لاوێتیدا تێکەڵاو بە سیاسەت و بەرەو هەستی نەتەوایەتی هەنگاو هەڵدەگرێ. بێشک ئەم کارەش لە لایەن داگیرکەرانی کوردستانەوە بەوپەڕی توندی و بە ئاگر و ئاسن وەڵامی خواستی تاکی کوردی داوەتەوە. کەریم کابانیش بەدەر نەبووە لەو وەڵامە توندانەی داگیرکەر و کەوتووەتە بەر شاڵاوی دڕندانەی ڕژێمی چەوسێنەر و داگیرکەر، هونەرمەند لە زێد و نیشتمانەکەی دوور دەخرێتەوە بۆ شارەکانی باشووری ئێراق. بێگومان ئەو هەڵکەندنە لە زێد و ناو فەرهەنگ و کولتووری نەتەوەکەی، کاریگەریی تەواو لەسەر ژیان و هونەری کەریم کابان دادەنێت.
جێگەی ستایش و ڕێز و حورمەتە بۆ هونەرمەندانی گەلەکەمان لە هەر بوارێکی هونەردا کاریان کردبێت، لەگەڵ ئەو هەموو چەوساندنەوە و ڕاوەدوونان و لەناوبردن و دزینی سەروەت و سامانی هونەری نەتەوەکەمان لە لایەن داگیرکەرانی کوردستانەوە، هونەرمەندەکانمان بە هەستێکی نەتەوەیی پڕجۆشوخرۆشەوە گەشەیان بە هونەرەکەیان داوە و بەرهەمی نوێیان خوڵقاندووە، بە بەرهەمە هونەرییەکانیان وەڵامی داگیرکەرانیان داوەتەوە، بێشک مامۆستا کەریم کابان یەکێکە لەو هونەرمەندە بەرز و خاوەن هەڵوێستەکانی گەلەکەمان.
(کەریم جەلال مەحمود) ناسراو بە (کەریم کابان) لە یەکێک لە گەڕەکە دێرینەکانی شاری سلێمانی بەناوی (مەڵکەندی شێخان) لە خێزانێکی (ئایینی / هونەری) لەساڵی (1927) بە دنیا هاتووە، بنەماڵەی کابان، بنەماڵەیەکی ناوداری ئەو شاری سلێمانین و بە بنەماڵەیەکی هونەری ناسراون، چونکە زۆرینەی ئەندامانی ئەو بنەماڵەیە دەنگیان خۆشە و سەرقاڵی کاری هونەرین.
(جەلال مەحمود)ی باوکی هونەرمەند پیشەی (چایچی) بووە، بەڵام دەنگخۆش و دەفژەنێکی زۆر بەتوانا بووە و لە زۆرینەی خوێندنەوەی مەولودنامەکان و سرووتە ئایینییەکانی شاری سلێمانی بەشداریی کردووە. لەو ڕوانگەیەوە، ئەم بنەماڵەیە بە بنەماڵەیەکی ئایینی و هونەری ناسراون.
کەریم کابان خاوەنی (سێ برا و سێ خوشکە) بە ناوەکانی (بەهادین، قادر، جەمال و بەدری،

کابان
زۆقادر

ئەختەر و شوکری). هەر سێ براکانی دەنگیان خۆشە و کاری هونەرییان ئەنجام داوە، بەتایبەت (شەهید قادرکابان) و خوالێخۆشبوو (جەمال کابان)، کە جیا لە دەنگخۆشییەکەی، ژەنیارێکی سەرکەوتووی تیپی موزیکی سلێمانی بوو.
مامۆستا کەریم کابان دوو جار ژیانی هاوسەریی پێک هێناوە، یەکەم هاوسەری بە خۆشەویستی خواستووە لە (ڕەواندز)، ئەویش بە هۆی کاری وەزیفییەوە کە باوکی پۆلیس دەبێت لە (سیدەکان) و ماوەی ساڵ و نیوێک پەیوەندیی خۆشەویستی لە نێوانیاندا هەبووە و پاشان ژیانی هاوسەری پێک دێنن. ئەو خاتوونە ناوی (سەبری) دەبێت و خاوەنی کچێکن بەناوی (نەخشە)، بەڵام ژیانی هاوسەرییان درێژە ناکێشێ و لێک جیا دەبنەوە.
کەریم کابان سەرلەنوێ ژیانی هاوسەری دروست دەکاتەوە لەگەڵ خاتوونێک کە کچی خاڵی خۆیەتی بە ناوی (ئایشە) لە ڕێکەوتی (5/9/1955) و تا ئێستا بەیەکەوە دەژین و خاوەنی (سێ کوڕ و دوو کچ) ن بە ناوەکانی (شوان، بەرزان و سۆران، چنوور و چیمەن).
هونەرمەند خاوەنی گەلێک خەسڵەتی جوانە، لە کەسایەتی و هونەرەکەیدا بەرجەستە بوون، مرۆڤێکی هەستناسک، کوردپەروەر، عاشق، عاشقی هونەر و سروشتی جوانی کوردستان و نەتەوەکەی، مرۆڤێکی قسەخۆش و خۆشمەشرەب و هەمیشە شیکپۆش، بەڵام جیا لە بەهرەی دەنگخۆشییەکەی، کەریم کابان ئاوازدانەرێکی باش و بەتوانایە و ئاوازی بۆ زۆربەی بەرهەمەکانی خۆیی و شەهید قادر کابان و چەند هونەرمەندێکی تر داناوە.
بەهرەی دەنگخۆشیی ئەم هونەرمەندە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی کە قوتابی بووە لە قوتابخانەی (فەیسەڵیە) و لە تیپی سروودی ئەو قوتابخانەیە وەک قوتابییەکی چالاک و دەنگخۆش گۆرانی و سروودی خوێندووە و بەشداریی چالاکییە هونەرییەکانی ئەو قوتابخانەیەی کردووە.
کەریم کابان قۆناغی خوێندنی سەرەتایی تەواو دەکات و بەردەوام دەبێت لە خوێندن و قۆناغی ناوەندی لە سلێمانی تەواو دەکات. بەڵام بە داخەوە، بە هۆی گرانی و سەختی ژیان و کاریگەرییەکانی جەنگی جیهانی دووەم، هونەرمەند ناتوانێت درێژە بە خوێندن بدات و دەستبەرداری خوێندن دەبێت.
هونەرمەند کەریم کابان وێڵە بە دوای برەودان بە هونەر و دەنگخۆشییەکەی و بە دوای کەناڵێکدا دەگەڕێت لەو ڕێگەیەوە گەشە بە هونەرەکەی بدات. لەو سەردەمەدا کە ڕادیۆ و هۆکارەکانی ڕاگەیاندن نەبوون یان زۆر کەم بوون، بەتایبەت بۆ شارێکی وەک سلێمانی و ئەو جەنگەماڵوێرانکەرەی کە جیهانی گرتبووەوە، خەڵک بێئاگا بوون لە کارەسات و ڕووداوەکانی جەنگی جیهانی دووەم. ئینگلیزەکان ئێستگەیەکی ناوخۆیی لە شاری سلێمانی دادەمەزرێنن، ئەو ئێستگەیە پێک دێت لە (ئەمپریفایەرێک و میکرۆفۆنێک و چەند بڵندگۆیەک)، لەبەر ئەوەی ئەو سەردەمە شاری سلێمانی هێندە گەورە نەبووە و بەردەرکی سەرا سەنتەری شار بووە و زۆرینەی چایخانەکان و دوکانەکان لەو شوێنەدا بوون، شوێنی کۆبوونەوەی خەڵک و ئاڵوگۆڕی کاڵاکان بووە، ئینگلیزەکان ئەو بڵندگۆیانە لە بەردەرکی سەرا و چەند چایخانەیەک دادەنێن. کاری ئەو ئێستگە ناوخۆییە تەنها ئەوە بووە کە هەواڵ و ڕووداوەکانی جەنگ بگەیەنێتە دانیشتوانی شاری سلێمانی. خوالێخۆشبوو (مەدحەت موبارەک) کارمەندێکی ئەو ڕادیۆیە بووە و کاری ئەوە بووە هەواڵەکانی وەرگرتووە و خوالێخۆشبوو (ئەحمەد عارف) وەک بێژەری ئەو ڕادیۆیە هەواڵەکانی خوێندووەتەوە. هونەرمەند (کەریم کابان) لە ڕێگەی بەڕێوەبەرایەتیی (مەعاریفی سلێمانی) یەوە بە نووسراوێکی فەرمی لەو ئێستگە ناوخۆیە دادەمەزرێت و بە شێوەی ڕاستەوخۆ گۆرانی دەخوێنێ و لە ڕێگەی ئەو بڵندگۆیانەوە خەڵکی شاری سلێمانی گوێبیستی دەنگی هونەرمەند دەبن. هونەرمەند کەریم کابان لە ساڵی (1945) بە

مەبەستی درێژەدان بە خوێندن ڕوو دەکاتە شاری (بەغداد)، بەو مەبەستەی لە (دار المعلمین ریفی) بخوێنێ، بەڵام بە هۆی وەرگیرانی ڕێژەیەکی زۆری قوتابی لەو خانەیە، هونەرمەند وەرناگیرێت و نائومێد دەبێت. هونەرمەند لەبەر ئەوەی زەحمەت و مانووبوونەکەی بەهەدەر نەڕوات، ناچار دەبێت ڕوو بکاتە بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیسی بێتەل (مخابرە). لەوێ وەردەگیرێ و دەبێت بە پۆلیس.

بە هۆی ئەوەی کەریم کابان هونەرەکەی هەمیشە لە یادە و ناتوانێت فەرامۆشی بکات، دەکەوێتە بیری ئەوەی چۆن خۆی بگەیەنێتە ڕادیۆی کوردیی بەغدا. دەکەوێتە پرسیارکردن و کاتێک دەبیستێ خوالێخۆشبوو (کامیلی کاکە ئەمین) بەڕێوەبەری ئێستگەی کوردیی بەغدایە، زۆر خۆشحاڵ دەبێت و هەرچۆنێک دەبێ، پەیوەندی بە کامیلی کاکە ئەمینەوە دەکات. ناوبراو زۆری پێ خۆش دەبێت کەریم کابان لە بەغدایە، دوای یەکتربینین و گفتوگۆکردن لەسەر کاری هونەری، کامیلی کاکە ئەمین پێشنیازی ئەوە دەکات لە ئێستگە لەگەڵ تیپی موزیکی ئێستگە گۆرانی بخوێنێ، کەریم کابانیش پێشنیازەکەی پەسەند دەکات و ئاماژە بەوە دەکات بە هۆی ئەوەی لە بەڕێوەبەرایەتی لاسلکی کار دەکات، دەرفەتی ئەوەی نییە بەردەوام سەردانی ئێستگە بکات، بەڵام تەنها دەتوانێ ڕۆژانی هەینی ئامادە بێت. کامیلی کاکە ئەمین ڕەزامەندی ئەدات و بە هونەرمەند دەڵێت هەموو هەینییەک پاش نیوەڕۆیان لە کاتژمێر (5 بۆ 5:30) تەرخان دەکەین بۆ خوێندنی بەرهەمەکانت، ئەو کاتە لەبەر نەبوونی ئامێری تۆمارکردن، بەرهەمەکان

به شێوەی ڕاستەوخۆ بڵاو کراونەتەوە.
هەموو هەینییەک کەریم کابان نیو کاتژمێر پێش ئەو کاتەی بۆی تەرخان کراوە، لە ئێستگە ئامادە دەبێت و لەگەڵ تیپی موزیکی ئێستگە پرۆڤە دەکات و لە وادەکەی خۆیدا گۆرانییەکان دەخوێنێ، گرووپی موزیکی ئێستگە لەو سەردەمە خوالێخۆشبوو (جەمیل بەشیر) سەرپەرشتیی کردووە. کەریم کابان بەو شێوەیە تا ماوەی (3) ساڵ بەردەوام دەبێت تا ساڵی (1947) بەرهەمەکانی پێشکەش دەکات.

هونەرمەند یەکەم بەرهەمی به شێوەی ڕاستەوخۆ لە ئێستگەی کوردی بەغدا لە ڕێکەوتی (1/7/1945) بڵاو دەکاتەوە، بەڵام لەگەڵ گۆرانیوتندا خولیای ئاوازدانانیش لە ناخیدا چرۆ دەکات و ئاواز لەسەر هۆنراوەی شاعیرانی گەلەکەمان دادەنێت و بە دەنگە خۆشەکەی دەیانخوێنێ، نموونەی ئەو هۆنراوانەش: (ئاواتی دووری و خۆزگەم بە پار) هۆنراوەی شاعیری مەزن (گۆران)، (لە ڕێی دڵداریدا) هۆنراوەی (شێخ ئەحمەد شێخ غەنی) ناسراو بە (فەوزی).

هونەرمەند لەساڵی (1947) بە هۆی کارەکەیەوە دەگوازرێتەوە و بەغدا بەجێ دێڵێت، بۆ ماوەیک لە هونەر و گۆرانی دوور دەکەوێتەوە. دوای چەند ساڵێک هونەرمەند بۆ مەبەستی تاقیکردنەوە و بەرزکردنەوەی پلەی وەزیفی (ترفیع) لە ساڵی (1954) ڕوو دەکاتەوە بەغدا و سەرلەنوێ پەیوەندی دەکاتەوە بە خوالێخۆشبوو (کاملی کاکە ئەمین). کاملی کاکە ئەمین بە هونەرمەند کەریم کابان ڕادەگەیەنێ دوای تەواوبوونی تاقیکردنەوەکەی پێم خۆشە سەردانی ئێستگە بکەیت. لەبەر ئەوەی ئامێری تۆمارکردنمان بۆ هاتووە. دەتوانی بۆ ماوەی (1) کاتژمێر گۆرانی تۆمار بکەیت. هونەرمەند زۆری پێخۆش دەبێت و دوای تەوابوونی کارەکەی دەچێتە ئێستگە و لەگەڵ گرووپی موزیکی ئێستگە پرۆڤە دەکات و (8) گۆرانی تۆمار دەکات، کە (5)یان فۆلکلۆر و سیانەکەی تر بریتی بوون لەو گۆرانییانەی کە پێشتر بە شێوەی ڕاستەوخۆ لە هەمان ڕادیۆ خوێندوونی و لە ئاوازی خۆی بوون وەک (ئاواتی دووری، خۆزگەم بە پار و لە ڕێی دڵداریدا).

دوای تۆمارکردنی ئەو بەرهەمانە لە ڕادیۆی کوردیی بەغداد، هونەرمەند بە هۆی تێکەڵاوبوون بە کاری ڕامیاری (سیاسی) کە لە لایەن ڕژێمەوە بۆ کورد حەرام و بڤە دانراوە، ڕژێم بە بڕیارێکی شۆڤێنییانە بڕیاری دوورخستنەوەی دەدات و دەیگوازنەوە بۆ شارەکانی باشووری ئێراق. (4) ساڵ و نیو لە شاری ناسریە و (5) ساڵ لە شاری دیوانیە ژیان بەسەر دەبات.

دوای ڕێککەوتنە مێژووییەکەی (11)ی ئازاری ساڵی (1970)، هونەرمەند کەریم کابان دەگەڕێتەوە شاری سلێمانی و جارێکی تر بە دیداری کەسوکار و هاوڕێیانی شاد دەبێتەوە و لە دونیای ئاواز و

گۆرانی نزیک دەبێتەوە. هەر لەو سەردەمەدا، واتە پاش گەڕانەوەی بۆ سلێمانی، ئاوازێکی نوێی لەسەر هۆنراوەیەکی مامۆستا گۆران، بە ناوی (لە درزی پەچەوە) داناوە. کەریم کابان جگە لەوەی برا گەورەی شەهید قادر کابان بووە، بەڵام زیاتر هاوڕێ بوون و هونەر لێکی نزیک کردوونەتەوە. قادرکابان لەژێر کاریگەریی دەنگی کەریم کابان‌دا بوو، ڕۆژێک لە ماڵەوە کەریم کابان ئەو ئاوازەی کە دایناوە، بۆ قادری برای دەخوێنێ و کاتێک قادر کابان گوێبیستی ئەو ئاوازە دەبێت، زۆری لەلا خۆش دەبێت، هەر لەو کاتەدا بە کەریم کابانی برای دەڵێت (کاکە ئەتوانم ئەو ئاوازە لە ئاهەنگێکدا لەگەڵ تیپی موزیکی سلێمانی بخوێنم) کەریم کابان ڕەزامەندی ئەدات و پێی دەڵێت زۆر ئاساییە، هەر لەو ساڵەدا تیپی موزیکی سلێمانی ئاهەنگێک ساز دەکەن و هونەرمەند کەریم کابان وەک میوان بۆ ئەو ئاهەنگە بانگهێشت دەکەن.

لە ئاهەنگەکەدا هونەرمەندی شەهید قادر کابان گۆرانی (لە درزی پەچەوە) بە دەنگە خۆشەکەی دەخوێنێ، هێندە بە هەست و سۆزەوە گۆرانییەکە دەڵێت، کەریم کابان زۆری پێ خۆش دەبێت کە قادری برای ئەوەندە بە سەرکەوتوویی ئاوازەکەی چڕی. دوای تەواوبوونی ئاهەنگەکە بە قادری برای دەڵێت لە ئێستاوە ئەو گۆرانییە بۆ تۆ و تۆ خاوەنیت، لە درزی پەچەوە لە نێو خەڵکیدا زیاتر بە گۆرانی (جادە چۆڵ و سێبەر بوو) نێوبانگی دەرکرد.

هونەرمەند کەریم کابان درێژە بە ژیانی تایبەتی خۆی دەدات و لە شاری سلێمانی سەرقاڵی کاری (پۆلیسی) دەبێت بە پلەی (ئەفسەر)، بەڵام هونەرەکەشی فەرامۆش ناکات و سەرقاڵی ئاوازدانان دەبێت، ئاواز لەسەر دوو هۆنراوە دادەنێت بە ناوی (یاران وەسیەتم و شەو). ئەو دوو ئاوازە بۆ ماوەیەکی زۆر لە ناخ و هەستی کەریم کابان‌دا دەمێننەوە و دەرفەت نابێ تۆماریان بکات.

هەرچەندە لەو سەردەمەدا جیا لە تیپی موزیکی سلێمانی، تیپی موزیکی مەولەوییش سەرقاڵی کاری هونەری بوون و خزمەتیان بە هونەر و موزیکی کوردی دەکرد. هونەرمەند کەریم کابان لەگەڵ تیپی موزیکی مەولەوی لە شاری (ڕانیە) بە سەرپەرشتی هونەرمەندی موزیکژەن خوالێخۆشبوو (قادر دیلان) گۆرانی خوێند.

ساڵی (1974) بە هۆی هەڵگیرسانەوەی شۆڕش لە باشووری کوردستان، کەریم کابان وەک کوردێک و هونەرمەندێک پەیوەندی دەکات بە شۆڕشی ئەیلولەوە، بەڵام لە ناو شۆڕش و خەباتی چەکدارانەی پێشمەرگەکانی کوردستان، پێشینەی کارەکەی کە ئەفسەری (مخابرە) بووە، هونەرمەند دەنێرن بۆ (ئەمانەی عامەی ڕۆشنبیری و لاوان و ڕاگەیاندن). لەوێ ئێستگەیەکی لاسلکیی لێدەبێت و کاری ئەم بەشە وەرگرتنی هەواڵ و چالاکییەکانی هێزی پێشمەرگە دەبێت، هونەرمەند لەو شوێنە دەستبەکار دەبێت.

کاتێک شۆڕشی ئەیلول هەڵگیرسایەوە لە ساڵی (1974)، کە خەڵکی کوردستان بەگشتی پشتیوان و هاوسۆزی ئەو خەباتە ڕەوایە بوون، هونەریش بەگشتی بەشێکی گرینگی سەرکەوتنی ئەو شۆڕشە بوو، تیپە موزیکییەکانی کوردستان (تیپی موزیکی سلێمانی، باواجی و هەولێر و چەند هونەرمەندێکی شاری کەرکوک و دهۆک) لە ناو شۆڕشدا تیپێکی نوێیان دامەزراند بە ناوی (تیپی موزیکی شۆڕش). ئەو هونەرمەندانەش هاوشانی برا پێشمەرگەکانیان درێژەیان بە هونەری بەرگری و خەبات دا.

وادەی نزیکبوونەوەی یادی شۆڕشی ئەیلول دەبێت، ڕۆژێک بەڕێز (د. کەمال مەزهەر) چاوی بە کەریم کابان دەکەوێت و پێی دەڵێت بەڕێزتان هونەرمەندن و دەنگتان خۆشە و پێم باشە بۆ یادی هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی ئەیلول، واتە (11/9/1974) چەند گۆرانییەک تۆمار بکەیت و

لە ڕێگەی ئێستگەی دەنگی کوردستانی ئێراقەوە بڵاو بکرێتەوە، کەریم کابان لە وەڵامدا دەڵێت منیش زۆرم پێ خۆشە و دوو ئاوازیشم ئامادەیە.
د. کەمال مەزهەر دەڵێت زۆر باشە، بۆ تۆمارکردنی بەرهەمەکانت و بۆ زانیارییت، برادەرانی تیپی موزیکی سلێمانی لە دێی (وەسان)ن لە ناوچەی (باڵەییان)، ناوی تیپەکەیان ناوە (تیپی موزیکی شۆڕش). پێم باشە بچیت بۆ ئەوێ و برادەران ببینیت و گۆرانییەکان تۆمار بکەن، دوای چەند ڕۆژێک، هونەرمەند کەریم کابان بەرەو دێی (وەسان) بەڕێ دەکەوێت بۆ دوو ئامانج، یەکەمیان بۆ دیداری هاوڕێکانی و دووەمیان بۆ تۆمارکردنی بەرهەمەکانی.
لە دێی وەسان بە دیداری ئەندامانی تیپی موزیکی شۆڕش شاد دەبێت. لەسەرەتادا ئەم هونەرمەندانە دەبینێت: (ئەلبێرت عیسا، ئەنوەر قەرەداخی، وریا ئەحمەد، فەرید عیسا، دلێر ئیبراهیم، سەلاح ڕەئوف، ئاراس ئیبراهیم، حەمەی شمشاڵ، و سەردار ئەحمەد، خالید سەرکار، عومەر سەرکار و ئیبراهیم سابیر... تاد) دوای دوو ڕۆژ پشوودان، هونەرمەندانی تیپی موزیکی شۆڕش لەژێر سێبەری دارگوێزەکانی دێی وەسان پێشەکیی ئەو دوو گۆرانییە بە نۆتە دەنووسنەوە، دوای پرۆڤەکردن بە یەک ڕۆژ هەردوو گۆرانییەکە بۆ هونەرمەند کەریم کابان تۆمار دەکەن، جێگەی پرسیار و سەرنجە کە هونەرمەندانی کورد بە چ بەدبەختی و نەبوونی پێداویستیی هونەری و تۆمارکردن لە بن بەرد و کەژ و کێو ئەشکەوتی کوردستان هونەرەکەیان فەرامۆش نەکردووە و هەمیشە لە خەمیدا بوون، کە هونەری نەتەوەکەیان پێش بکەوێت، بە ڕاستی هونەرمەندانی گەلەکەمان، بەتایبەت ئەو هونەرمەندانەی کە بەردەوام هەستی نەتەوەیی و بەرەوپیشچوونی هونەری کوردیان لا مەبەستە جێگەی ڕێز و حورمەتن و بەرزنرخاندنی کارە جوانەکانیان بۆ ئێمە زۆر پێویستە.

پێویستە ئەرک و ماندووبوونی بەڕێزێک فەرامۆش نەکەین، کە لەو سەردەمەدا خزمەتێکی باشی کردووە، ئەویش (جیهانبەخش کۆیی). ئەو بەڕێزە بە ئامێرێکی تۆمارکەری سادە ئەو دوو گۆرانییە (شەو و یاران وەسیەتم) کە هەردووکیان لە ئاوازی خودی هونەرمەندن، بۆ هونەرمەند کەریم کابان تۆمار دەکات.

دوای تۆمارکردن، گۆرانییەکان ڕەوانەی ئێستگەی دەنگی کوردستانی ئێراق دەکەن و شەوی (11/9/1974) بە بۆنەی یادی شۆڕشی ئەیلول بڵاو دەکرێنەوە. دوای چەند ڕۆژێک لە بڵاوکردنەوەی ئەو گۆرانییانە، لە سەرتاپای شوێنە گشتییەکان ئەو گۆرانییانە دەبیستران و ببوونە جێگەی ڕەزامەندی و وێردی سەرزاری خەڵکی.

دوای هەرەسهێنانی شۆڕشی ئەیلول، کەریم کابان وەک هەر هاوولاتییەکی کورد ڕووبەڕووی باردوخێکی ناهەمواری دەروونی دەبێتەوە و لە دوای ئەو شکستە گەورەیە ناچار دەبێت بگەڕێتەوە بۆ شاری سلێمانی.

هونەرمەند کەریم کابان لە ساڵی (1975) دەبێت بە ئەندامی تیپی موزیکی سلێمانی. یەکێک لە شانازییەکانی کەریم کابان ئەوەیە کە ئەندامی تیپی موزیکی سلێمانییە و هۆکارێک بۆ سەرکەوتنی کارە هونەرییەکانی هونەرمەند تیپی موزیکی سلێمانییە، کە هەمیشە پشتیوان و هاوکاری بەئەنجامگەیاندنی بەرهەمە هونەرییەکانی هونەرمەند بوون. دەکرێت ئەوەش بڵێم مایەی گەورەیی و سەروەرییە کە تیپێکی وەک تیپی موزیکی سلێمانی کەریم کابان وەک هونەرمەندێک کاری هونەری لەگەڵدا ئەنجام داون و هەمیشە بە شانازییەوە ناویان دەبات. هەروەها هەڵبژاردنی تێکستی گۆرانییەکانیەتی و کە تا ئەمرۆ لای گوێگری کورد بە زیندوویی ماونەتەوە، چونکە دەنگی ئەو هونەرمەندە دەنگێکی کوردی و موزیکییە، کە هەرگیز بیسەر بێزار ناکات.

دوای ئەوەی هونەرمەند دەبێت بە ئەندام لە تیپی موزیکی سلێمانی، تیپی موزیکی سلێمانی لە دوای ساڵی (1975) بەوپەڕی لە خۆبوردوویی و هەستی نیشتمانی و بەرپەرچدانەوەی ڕژێم دوای ئەو شکستە گەورەیەی شۆڕشی ئەیلول، کەوتنە کارکردن و چالاکی و کۆمەڵێک کاری جوانیان ئەنجام دا. ئەو دوو گۆرانییەی پێشتر ئاماژەمان پێدان، جارێکی تر بە شێواز و تەکنیکێکی تر و دابەشکردنێکی موزیکی نوێوە، کەریم کابان بە هاوکاریی تیپی موزیکی سلێمانی ئەو دوو بەرهەمە لە تەلەفیزیۆنی کەرکوک بە شێوەی ڕەش و سپی تۆمار و بڵاو دەکاتەوە.

ئەو بەرهەمانەی هونەرمەند لە ماوەی ژیانی هونەرییدا ئاوازی بۆ داناون و تۆماری کردوون و بوونەتە ئەرشیڤ: گۆرانی (خەنەبەندان لە هۆنراوەی (بێسارانی)، پرسیار لە هۆنراوەی (کامەران موکری)، فرمێسک و شیعر لە هۆنراوەی (فەرەیدون عەبدول بەرزنجی)، هەروەها لە بواری فۆلکلۆریشدا ئەم گۆرانییانەی خوێندووە (لێ لێ و لۆ لۆ، باوانم باوانم، هەی یار، خۆزگەم بە پار و مێولێو دێلێژە... تاد)، جگە لەو ئاوازانەی خۆی خوێندوونی، ئاوازی بۆ خوالێخۆشبوان (قادر کابان و عوسمان عەلی) داناوە و هەروەها ئاوازی لەسەر هۆنراوەیەکی (شێخ حەسیب قەرەداخی) داناوە و داویەتی بە (کامەران عومەر).

گۆرانیی (تەمەن) یەکێکە لە شاکارە دیارەکانی کەریم کابان. گۆرانییەکی پڕ چێژ و هەستە کە کەریم کابان دوای بەسەربردنی تەمەنێکی پڕ لە هەوراز و نشێو، لەم ساڵانەی دواییدا لەگەڵ تیپی موزیکی سلێمانی بەرهەمی تەمەنی خوێند. تەمەن لە هۆنراوەی شاعیر (ئەحمەد محەمەد) و ئاوازی هونەرمەند (زانا مەحمود هەژار)ە، خوێندنەوەی بەندە بۆ هۆنراوەی تەمەن و برای شاعیر

(ئەحمەد محەمەد) ئەوەیە، کە ئەحمەد محەمەد لە و هۆنراوەیەدا بووەتە پەیکەرتاشێکی شارەزا و بەئەزموون، بە هەست و ئیحساسێکی ناسک و جوانەوە لە وشە پۆرتریتێکی بۆ هونەرمەند کەریم کابان دروست کردووە. هەرچەندە ئەو هۆنراوەیە ئەحمەد محەمەد بۆ کەریم کابانی نەنووسیووە، بگرە زۆر پێش لەدایکبوونی ئەو ئاوازە ئەو هۆنراوەیە نوسراوە.
ئەحمەد محەمەدی شاعیر سەبارەت بە شیعری تەمەن دەڵێت: (یەکێکە لەو شیعرانەی کە هەمیشە شانازیی پێوە دەکەم، بەڵام ئەو شیعرە تایبەت نەبووە بە مامۆستا کەریم کابان، ئەو شیعرەم لە سەرەتای تەمەنی لاوێتیدا نووسیووە، سوپاس بۆ هونەرمەند کەریم کابان حەقی تەواوی بەو شیعرە داوە) .
تەنها ئەوەندە ماوەتەوە بڵێین خەرمانی هونەریی هونەرمەند کەریم کابان بەبەرەکەت و ڕێز و حورمەت و خۆشەویستی بۆ تەواوی ئەندامانی تیپی موزیکی سلێمانی و هەموو ئەو ژەنیارانەی ڕۆژێک لە ڕۆژان کاری هونەرییان لەگەڵ هونەرمەند کەریم کابان ئەنجام داوە و ئەرشیفی هونەر و موزیک و گۆرانیی کوردییان بە شێوەی ڕاست و ڕەسەن و مۆرکی کوردی دەوڵەمەند کردووە.
تەمەن
ئەی تەمەنی پڕ ئەسرینم ئەڕۆی ئاوڕ نادەیتەوە
لەگەڵ هەموو هەنگاوێکتا لە عومری من ئەسڕیتەوە
خۆزگە منیش وەک پەپوولە گشت تەمەنم وەرزێک بووایە
دوور لە خەم و تاڵیی ژیان، تەنیا گوڵم بناسیایە
ڕێگام سەودای تەنیاییە و کەسێک نایەت بۆ سەردانم
ئێتر چی بکەم لەم تەمەنە، کە لە هەمووی پەشیمانم !
لە گریانی مناڵیما پێکەنینم بە خەم ئەهات
کەچی ئێستا خەم دەریایە و بۆ کەنارم شەپۆل ئەدات
لە سەد جارا تەنیا جارێک زەردەخەنە دێتە میوان
وەک سێبەری لای ئێوارەی خۆرنشینی دار ئەرخەوان
ئەی هاوڕێیان، چاوم نوقمی نیگارێکی پڕ بەهارە
تاسەم وەری، بەڵام هێشتا خۆشەویستیم هەر بێدارە !
ئێستاش گەڵای عومری گەنجیم وەکو پاییز هەڵوەریووە
کێ وەکو من تەم و خومار پەنجەرەکەی داپۆشیووە!؟

# کەریم کابان

**عەلی پێنجوێنی**

زیاد لە نیوسەدە داهێنان، داهێنانێک پڕ لە ترس، ترسێک پڕ لە جوانی، جوانییەک کە جۆرێک لە موعجیزەی بەرهەم هێنا. کێ هێندەی کەریم کابان کەم گۆرانیی وت؟ کێ توانیی لەو کەمییە کەمەدا ئەو پانتاییە لە داهێنان داگیر بکات؟ بەڵام داگیرکردنێک پڕ لە جوانی. هەمومانی دایە بەر دەسرێژی دەنگێک، کە لە گشت دەنگەکانی دنیا جیاواز بوو.

ئەگەر دیوێکی دەنگی موعجیزەئاسای کەریم کابان گەردوونی بێت و هەر ڕۆحێکی بریندار بتوانێ لە هەر گۆشەیەکی دنیاوە گوێی لێبگرێ، ئەوا دیوەکەی تری دەنگی ئەم پیاوە دانسقە و کەموێنەیە، کە لە ڕێگەی دەنگیەوە جوگرافیا دەنووسێتەوە،

جوگرافیای سلێمانی نیشتەجێی ناو قورگ و دەنگی کەریم کابانە. دەزانن چەند سەختە لە ڕێی دەنگ و گۆرانییەوە جوگرافیا و شوێن بنەخشێنی؟ کەریم کابان ئەم سەختی و مەحاڵییەی کردە واقیع، گەرچی ئەو ڕۆحە سەوداسەرانە لە چ گۆشەیەکی ئەم دنیایەدان، ئەو ڕۆحە بریندارانەی چوارقوڕنەی دنیا تەی دەکەن بە شوێن زەمزەمەکانی جوانیدا، بەڵام لەمە سەختتر ئەوەیە سلێمانی بە هەموو ڕەهەندەکانیەوە لە ناو قورگ و دەنگی ئەم پیاوەدا قولپ ئەدا. زیاد لە نیوسەدەیە ئەم پیاوە دانسقەیە پەلەی نییە و هەر نزیکەی ٢٠ گۆرانیمان پێشکەش دەکات، بەڵام هەر گۆرانییەک نەک هەر هێزی مانەوە، بەڵکو هێزی بڕینی زیاد لە سەدەیەکی هەیە. ئەو پێمان دەڵێ گەر گۆرانییەک هێزی مانەوەی نەبێ لە گشت زەمەنەکاندا، چ پێویست دەکات بوترێ؟ ئەم دەنگە دڵنشینە پێمان دەڵێ مادام تا ژیان هەبێ، دەبێ دڵ هەبێ و لێبدا، کەواتە دەبێ گۆرانی دڵنشین بێت.
ئەو دەمانەی گڕ و شەڕ و شۆڕش و باروت هونەر و ئەدەبیان دەخستە سەر کەڵکەڵەی ئەو وەزیفانەی بە هیچ جۆرێک وەزیفەی ئەدەب و هونەر نەبوون، ئەو دەمانە کەریم کابان لە ڕێی گۆرانییە کەم و دانسقەکانیەوە پێی دەوتین دەبێ گۆرانی بۆ دڵ بوترێ، نەک بۆ فیشەک. دەبێ گۆرانی ڕۆح بلەرزێنێ، نەک ببێتە مەتەرێزی شۆڕش و فیشەک. شۆڕشگێڕەکان بە مژدەی قورسەوە ڕۆشتن و گۆرانییان دەبرد بۆ بەرەکانی جەنگ و ناویان نابوو هونەری بەرگری، کەچی هاتنەوە، دەستبەتاڵ لە جوانی و تەرمی گۆرانییەکانیان بەشانەوە بوو. دەنگی کەریم کابان هاوسەفەری ئەو جۆرە لە هونەر و گۆرانی نەبوو، دەزانن بۆ؟ چونکە کەریم کابان لەدووی جاویدانی دەگەڕا، ئیدی سەرەنجام ئەو تەرزە لە هونەر و گۆرانی ڕۆشتن و لەگەڵ دووکەڵی شۆڕشدا ون بوون. بەڵام هونەری نەمری کەریم کابان مایەوە، ئەم پیاوە دەگمەن و دانسقەیە باش دەیزانی دۆزینەوەی جوانیی جاوید پێویستی بە ترسێکی قووڵ هەیە دەنگێک کە ڕازی نەبێت گۆرانیبێژی سات و سەردەمێکی دیاریکراو بێت، هەر دەبێ بە ترسەوە لە جوانیی جاوید بگەڕێ.
خودایە تۆزێک لەم ترسە جوانە کە داهێنان بەرهەم دێنێ، ببەخشە بە هونەری کوردی!! دەنگێک کە ڕازی نابێت بەرهەمەکانی وەک خواردنی مەعەللەب بۆ ژەمێک بێت و ئیدی ئێکسپایەر بێت، هەر دەبێ بە ترسێکی قووڵەوە لە جوانیی جاوید بگەڕێ، دەنگێک دێت وەک نەشتەر ڕابوردوو و ئێستا و داهاتوو دەبڕێت. خۆزگە دەمتوانی بە دڵی خۆم قەترەیەک لەو فەنابوونە بنووسمەوە، کە لە دەنگی ئەم پیاوە دەگمەن و دانسقەیەدایە و لە دڵمایە، بەڵام بە داخەوە ناتوانم هیچی لەسەر بنووسم.

